# نووسەری نوێ

15
ئەیلولی 2000

گۆڤارێکی ئەدەبیی مانگانەیە
یەکێتی نووسەرانی کورد/لقی هەولێر دەری دەکات

## تایبەتە بە شیعر



ژمارە 15
گەلاوێژ ٢٧٠٠ک - ئەیلول ٢٠٠٠ ز


# نووسەری نوێ

گۆڤارێکی ئەدەبیی مانگانەیە
یەکێتیی نووسەرانی کورد
لقی هەولێر دەری دەکات




ناونیشان : هەولێر ت: ٢٢٢٨٠


ئەو بابەتەی بڵاو دەکرێتەوە، خاوەنەکەی لێی بەرپرسە


پیتچنین و کاری هونەری: کۆمپیوتەری یەکێتی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر
چــاپ : چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری

# لەم ژمارەیەدا

# ئەم بەرهەمە ئەدەبیانە



**دوکتۆر مارف خەزنەدار**

یەکێتی‌ی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر ڕووی ڕێزی لێ نام و ئەم کۆمەڵە شیعرەی خستە بەردەمم بۆ ئەوەی بیروڕای خۆمیان لەسەر بنووسم بۆ ئەم ژمارە تایبەتی‌یەی کۆواری "نووسەری نوێ"ی ڕەنگین کە بەناوی شیعرەوە بڵاودەکرێتەوە.

ئەوی ڕاستی بێ ئەگەر ئەم کۆمەڵە شیعرە زۆرە بخرێتە خانەی ڕەخنەی ئەدەبی‌یەوە بێ گومان کاتێکی درێژو ماوەیێکی فراوان و نووسینێکی زۆری دەوێ لەوانەیە لە قەوارەی کتێبێك نەبێ جێیان نەبێتەوە. لەبەر ئەوە من ئەم نووسینەم بەناوی ناساندنی بەرهەمەکان بە خوێنەرانی ئەم بڵاوکراوەیە ئامادەکرد.

بەرنامەی ئەم نووسینەم ئەوەبوو بە ڕیز یەکە یەکە شیعرەکانم خوێندەوە، هەندێکیان جارێك و هی دیکەیان لە جارێك زیاتر، ئیتر یەکسەر ئەو تێبینی‌یەی لام دروست دەبوو لە چەند دێڕێکدا بە کورتی تۆمارم دەکرد. لێرەدا ئەوەی گرنگ بێ ئەوەیە ئەو بیروڕایەی لەبارەی شیعرەکانەوە خراونەتە ڕوو تەنیا لە بابەت شیعرەکەوەیە، هیچ جۆرە پێوەندیێکی بە شاعیرەوە نی‌یە، هەروەهات پێوەندی بە شیعری دیکەی شاعیریشەوە نی‌یە. بێ گومان لە ناو ئەم هەموو شاعیرانە هەندێکیان دەناسم و هی تریان ناناسم، هی وای تێدایە تەنیا ئەم شیعرەیم دیوەو هی واشی تێدایە هەموو شیعرو کۆمەڵە شیعرە بڵاوکراوەکانیم خوێندۆتەوە، جا ئەمە هیچ

پێوەندی‌یێکی بەم قسانەوە نی‌یە کە لەبارەی ئەم شیعرانەوە دەرم بڕیوون، ئەمە زادەی خوێندنەوەی تەنیا ئەو شیعرەیە کە لەم ژمارە تایبەتی‌یەی (نووسەری نوێ) بڵاوکراوەتەوە. بێ گومان ئەوەی لێرە بڵاوکراوەتەوە ئەگەر (باش) بێ خاوەنەکەی ناکا بەشاعیرێکی گەورە،ئەگەر (خراپ)یش بێ نایکا بە شاعیرێکی بچوک، هەر چەندە شاعیری بچووک لە فەرهەنگی ڕەخنەی ئەدەبیدا نییە. لە هەندێ پارچە شیعردا بیروراکانم بەرامبەریان بە ترسەوە هاتوون، چونکە دوو دڵ بووم نەوێرام بڕیاری تەواو و ئاشکرا دەربڕم، دوو دڵی‌یەکەم لەوەوە هات بوو لە هەندێ هەڵوێست دا بە گشتی نەك تەنیا لەم شیعرانەدا نەمدەتوانی (داهێنان) لە (وەرگرتن) جیا بکەمەوە واتە لەو هەڵوێستانەدا ئەگەر وێنەیێك یا مانایێك یا بۆچوونێکم بە دڵ بووبێ یەکسەر بە ڕەسەنی دابنێم، جاری وا هەیە ڕەسەنی داهێنراو ناتوانم لە وەرگیراو جیا بکەمەوە، بۆیە خۆم تووشی ئەوە نەکردووە وێنەیێك وەرگیراوە بە ڕەسەنی دابنێم لەبەر ئەوەی جوانە.

ئەم بەرهەمە ئەدەبی‌یانە نموونەی شیعری هەر سێ نەوەی ئەدەبی کوردین، واتە لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە تا ئێستا. ئەمە کارێکی باشە، بەڵام باشتر دەبوو هەموو شاعیرانی ئەو سێ نەوەیە شیعری تازەیان پێشکەش بکردایە بۆ ئەم مەبەستە، بۆ بەڵگە دڵـزار شـیعرێکی لـە چـل سـاڵ لەمەوپێشـی دەسـت نیشـان کـردووە بـۆ بڵاوکردنەوە، کەچی عەباس عەبدوڵلا یووسف شیعرێکی زادەی لە بیست ساڵ زیاتر پێشکێش کردووە.

وەکو لەسەرەوە باسم کرد گەشتێکی کورت بەناو گوڵزاری ئەم بەرهەمانەدا دەکەم.

* * *

- دڵزار لە "ڤینی گەل"دا ئەوەی دەربڕیوە دەبوو وابێ، چونکە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم ووتراوە کە هێشتا شیعری کلاسیکی تەقلیدی باوی مابوو. شاعیر باس لە ناهەمواری سەردەمی فەرمانڕەوای مەلیك دەکا، بۆچوونەکانی لە رووی سیاسیو کۆمەڵایەتی‌یەوە راستن، رووداوەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ زۆر گرنگ بوون، گەلێ شتی خراپیان لە ناوبرد، بەڵام گەلێ شتی خراپتریشیان هێنایە نـاوەوە. لـەو سـەردەمەدا ئـەم بیروڕایانـە دەخرانـە نـاو قـاڵبی شـیعری کلاسیکی‌یەوە، بەڵام بۆ شیعری تازە بەم شێوازە دەس نادەن. شاعیر کارێکی باشی کردووە بەوەی رۆژی دانانی شیعرەکەی دیاری کردووە.

د مارف خەزنەدار

- غەریب پشدەری لە (هەوارگەی وێران)دا موناجاتێکی دیکەمان پێشکێش دەکا، ئەمە بەرهەمێکی داخراوە، بەڵام هەناسەی کوردانەیە چونکە تەعبیری خۆماڵی بەکارهێنراو رەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردەواری‌یە، رستەو تەعبیرەکان بە تەنیا ئاشکران پێکەوە بەرهەمەکە دەبنە ناو گێتی‌ی سیمبۆلیزم.
- ئەنوەر مەسیفی لە (قوڵغەکان)دا قسە دەکا، ئەو قسانە بە هەر زمانێك بووترێن دەچنە ناو گێتی‌ی داهێنانەوە، تەنیا زمان نا بەڵکو بەهەر شێوازێك بووترێن، کێش و قافیەیان هەبێ یا نەبێ، ریتم و مۆسیقایان هەبێ یا نەبێ دەبن بە قسەی جوان، وێنەیێکن بە خەیاڵ دا تێدەپەڕن. لە پێش مێژووش شیعر هەروا بووە، بەڵام هی ئەو کاتە بۆمان نەماوەتەوە.
- عەباس عەبدوڵلا یووسف لە (کێ ئەم شارانەی دروست کرد؟!) باس لە ڕمانی شارستانیەت دەکا، زانستی پێشکەوتووە، بەڵام هیواو ئامانجی هەموو مرۆڤایەتی جێ بەجێ نەکردووە. هەندێ ووشەی تازەیە، مەبەستم لە زمانی کوری‌دا هەیە، بەڵام بە نووسین بەکار نەهێنراوە، ئەمە کێشەی هەرە گرنگی رۆشنبیری کوردی‌یە، چونکە پراکتیکی نووسینمان کەمە، واتە کتێب و بلاْوکراوەمان کەمە.
- مەهدی خۆشناو لە (شەوێك) دا داستانی بوون و نەبوون بۆ کوردستان دەگێڕێتەوە. ئەم داستانە موناجاتە، لاواندنەوەو سەردولکەیە بۆ نەخۆشێك نەمردووە. بەڵام دەیانەوەێ بیمرێنن. ئەگەر ئەم بەرهەمە بە ماتەمنامە بژمێرین هەندێ لە شیعرە بە کوڵەکانی فیردەوسی و شکسپیرو بێسارانی ومستەفا بەگی کوردی‌و گەلێکی دیکەمان دێنێتەوە یاد. زمانی ئەم بەرهەمە سوارە، ماناو وێنەی ئاشکراو دیارە، خۆشویستنی کوردستان سنووری بۆ نی‌یە. ئینفیعالی ناوەوەی مەهدی خۆشناو گەیشتۆتە پلەیێك تەنیا خۆی ناگرێ، بەڵکو خوێنەریش دێنێتە گریان.
- کەریم دەشتی لە (شاعیر)دا وەسفێکی دیکەی شاعیرمان بۆ دەکا، دەڵێم وەسف چونکە شیعرو شاعیر تەعریف ناکرێن، بەڵکو وەسف دەکرێن. شاعیر دەبێ قەنارەکەی لەسەرشانی بێ، چونکە کەم کەس تێ‌ی دەگەن، ئەوانەی تێشی دەگەن وەکو خۆی وان، بۆیە دەبنە دوو گێتی جیاواز، گێتی‌ی شیعرو گێتی‌ی ناشیعر.

• موحسین ئاوارە لە (دایکم - کۆچی بە سویّ)دا پۆیمێکی کورت دروست دەکا، بەسەرهاتی سۆزی دایکیەتی دەگێڕێتەوە. ژیانی کردووە بە دوو قۆناغ. کۆن هەر چەندە دواکەوتوو بووە بەلاّم بایەخی خۆی هەبووە، سەردەمی ساوەر کولاّندن و دەستارو دینگ. قۆناغی دیکە هەرچەندە پێشکەوتوو بووە کەچی خۆکوژیو کورد کوژیو برا کوژیو کارەسات دەستی پیّ کردووە. لەگەلّ ئەوەش دا مەفهوومی دایکیەتی هەر دەمێنێ.

• ئازاد دلّزار (سەراب)مان دەخاتە بەردەم. ئەگەر ئازادم لە رێگەی شیعرەکانی دیکەیەوە نەناسیایە رەنگ هەبوو لەو پارچە شیعرە لیریکی‌یە نەگەم. لەگەلّ ئەوەش دا ناوی بەرهەمەکە (سەراب) ناوەرۆکی هەندیّ روون دەکاتەوە. حالّ واشێواوە وەك (سەراب)ی لیّ هاتووە، واتە حەقیقەت و وەسف و تەعریف دەسگیر ناکریّ، لەو کاتەی کە دەبیّ بکریّ.

• جەلال مەلەکشا لە (شەوەکی ئەبوونواس)دا دەیەویّ ئیلهام لە پیری موغانی کۆن و مەیو مەیخانەی سۆفی‌یە حەقیقی‌یەکانی سەردەمی عەباسی لەبەغدا وەربگریّ. مۆدێرنیزمانە ئەبوونواس بەکاردێنیّ چونکە بە راستی خۆیو هاورێکەی نوێنەری ئەبوونواس بوون نەك مەنسووری هەلاج، چونکە ئەم دوو کابرایە ئەبوونواس و مەنسووری هەلاج لە مێژووی ئیسلامی و بەتایبەتی مێژووی بەغدای سۆفیزم دوو کەسی جیاواز بوون.

• د.لەتیف محەمەد لە (حەوت چریە شیعری دی) جەوت چریە یا حەوت شیعرە برووسکە دروست دەکا. لەتیف رۆمانتیکی‌یانە خەیان ئاسایی بینینێکی کورت دەخاتە ناو کۆمەلّە ووشەیێکەوە پێوەندی بە ئەمڕۆی نەتەوەو نیشتمانەوە هەیە.

• محەمەد عومەر عوسمان، (تەم و مژ)ی لەسەردەمێك نووسیوەتەوە، مەسەلەی نیشتمانیو نەتەوەیی کورد کپ بوو، عیراق لە جەنگ دابوو لەگەلّ ئێران، تاکتیك و ستراتیجی ناوچەی رۆژهەلاّتی ناوەراست سەری لیّ شێوابوو لەدەست سیاسەتی چاوچنۆکانەی سۆڤیەتی ئەوکاتەو ئەمەریکا. ناوێکی زۆر ئیسماعیل و ئیبراهیمی خەلیل و یووسفی یەعقووبی کە هەردووکیان پێغەمبەرن لەگەلّ مەسیح و مەریەم و هابیل و قابیل دەورکردنەوەی پەندێکی زۆرو رۆژگارێکی درێژە، بۆ پارچە شیعرێکی لیریکی زۆرە، لە شیعری کلاسیکی عەرووزی

عەرەبیو فارسیو تورکی عوسمانیو کوردی ئەم هەموو خەڵك و رووداوانە لە قەسیدەیێك دا جیٚیان دەبووەوە.

- نیگار نادر لە (نیشتمانێك لە شووشە)دا مەسەلەیێکی یەکجار گرنگی کۆمەڵایەتی دەخاتە روو کە (ژن)ە، ئەمە نیوەی کۆمەڵ و مرۆڤایەتی و بوونە، بەڵام تەرکیبی بیۆلۆجی و ئەنەتۆمی (هەموو ئەندامەکانی لە شی مرۆڤ) لە سەرەتای ژیانی ئادەمزادەوە تا ئێستا ئەم کێشەیەی بۆ دروست بووە کە یەکسان نابیٚ لەگەڵ پیاودا. ئەیسە ئەمە مەسەلەیێکی قووڵ و گرنگ و درێژە لەم ماوەیەدا جێی باس کردن نییە. بەڵام نیگار لەم بەرهەمەدا توانیویەتی میحنەتی ژن بخاتە ناو قالبێکی ئەدەبیو خوێنەر بهزوێنیٚ.
- محەمەد باوەکر لە (بە ئاوخنکاندنی ئەهەنگ)دا کۆمەڵە ووشەیێکی کەم بەکارهێنراو، رستەو تەعبیری لیٚ دروست دەکا، ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی تەم و مژی رۆمانتیکیو سیمبۆلی باڵی بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکەدا بکێشیٚ، بەم جۆرە بووە بەیەکێك لە بەرهەمە داخراوەکان. نازانم شاعیرانی سەردەم بۆ دەبیٚ بەم جۆرە مامڵە لەگەڵ (مەسیح) یا (یەسوع) بکەن! راستە کارەسات لای ئێمە زۆرە. بەڵام نموونەش لە دەرەوەی مەسیح و سەر بە رۆژئاواو رۆژهەڵات زۆرە.
- ئیسماعیل بەرزنجی لە (حەنین دەمکوژیٚ)دا باسی گوڵ دەکا، گوڵەکان چارەنووسی نەتەوەی کوردن. چارەنووس نەهاتۆتە دی. بەلاچم نەشمردووە، ئیسماعیل لەخۆی جیایان ناکاتەوە، لەگەڵ خۆیدا دەیانبا بۆ هەموو جیٚیێکی کوردی لێیە. یا پێوەندی بە کوردەوە هەیە. ئەگەر چارەنووس دەسکەویٚ لێرە دەس دەکەویٚ، لە سویدو ئەڵمانیاو ئەمەریکا دەس ناکەویٚ. ئەوانەی ئەویٚ دەستیان لیٚ بشۆ، چارەنووس لە سەر خاکی نیشتمان دێتە دی، ئەگەر نەهاتە دی هەر لە نیشتمانیش دەنێژریٚ.
- گوڵاڵە حوسێن لە (سەمای هەرزەکاری)دا دەمانباتە ناو گێتیی هەندیٚ مەفهوومی رۆژئاوایی بەرامبەر بە وشەی جوان. وێنەکانی مرۆڤایەتین بەڵام لە ئەدەبی رۆژهەڵات دا کەم بەکار هێنراوون، ئەمەش ئەوە ناگەیەنیٚ کە نابیٚ لای ئێمە بەکار بهێنرێن. بەڵام خۆ دەبیٚ شەقلی ئێرەیان پێوە بیٚ.
- رۆستەم باجەلان لە (تارمایی و سێبەری بوون)دا خەریکی ئەدەبی منداڵان نییە، بەڵام لەگەڵ منداڵدا دەژی، بە زمانی ئامۆژگاری منداڵانەوە هەوڵ دەدا بە

قسەی جوان ئامۆژگارییەکانی دەربڕی، بەهێمنی و لەسەرخۆ. رەنگە مەسەلەکەش ئیسبی بێ وەهەڵوێست بەرامبەر ئەم بەرهەمە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە بگۆڕێ.

- حەمە عەباس (رەنگە تیرەکانی من) پێشکێش دەکا، ئەمە سێ برووسکە شیعرییە لە سێ هەڵوێست دا خۆی پیشانمان دەدا، هەندێ جار وا هەست دەکەی پێوەندییان بە یەکترییەوە هەیە. هەندێ جاری دیکەش وا دەزانی هەریەکەی سەربەخۆیەو پێوەندی بە ئەوانی دیکەوە نییە. هەمووی بە ریتمێك لە ناو هەر رستەیێك دا ئینسیجامی ناوەوەی خۆی هەیە.
- حەمە سەعید جاف کەلاری لە (یاداشتی بەفرو گوێزو مسك)دا گۆرانییێکی سیمبۆلییانە دەبێژێ، پڕ لە تەم و مژە. کە ناوی (شنرویْ) بێ پیاو بیر لە هەڵەبجە دەکاتەوە. هەر کەسە بەپێی چێژو خەیاڵی خۆی دەتوانێ بنوارێتە ئەم بەرهەمە ئەدەبییە.
- سامان دزەیی لە (ئاکام)دا باس لە ئێستا دەکا، هەندێ لە تەنگوچەڵەمەکانی دەخاتە روو، ئەوەی دەیەوێ هێشتا دەستی نەکەوتووە، توانیویەتی بە ووشەی شاعیرانە بڵێ: لە ناخۆشییەکانی چاوەڕوانی. گۆرانییێکی ووتراوین.
- ئەکرەم عەنەبی لە (تزای مردن)دا بەرهەمێکی رەمزی تەم و مژوای ئەوەندە تێك ترنجاو دروست دەکا کردگار تێیدا بێ دەسەڵاتە. جا بە هەموو جۆرێك کردگار هی هەر ئاینێك بێ بێ دەسەڵات نابێ. لەوانە یە لەم بەرهەمەدا رەشبینی خاوەنەکەی گەیشتبێتە پلەیێك کردگارێکی بێ دەسەڵات دروست بکا؟ ئێمە ئەوە دەزانین ئەوەی لە حەقیقەت دانابێ لە شیعردا دەبێ.
- سالار عوسمان لە (گەڕان بە دوای نیشتمان دا) وێڵ و سەرگەردانە لێی دەگەڕێ، بۆی نادۆزرێتەوە، دەیەوێ هۆی وون بوونەکە بزانێ، ئەمە لە دۆزینەوەی نیشتمان گرنگترە بەلایەوە.
- فەیسەڵ دێهاتی (تەلبەند) پێشکێش دەکا، لەبەندی یەکەم دا مرۆڤ لە نامرۆڤ جیا دەکاتەوە، دەس نیشان کردنی نامرۆڤ کارێکی قورسە بە لایەوە، ئەمانە جۆرو چەشن و بابەتیان زۆرە، لەهەموو بارێك دا لە (گیان) ناگەڕێن، بەڵکو خەریکی دۆزینەوەی (مادە)ن. لەبەندی دووەم دا فەیسەڵ لەسەر ئەو باوەڕەیە جوانی لە قۆناغێکی دیاریکراودا شتێکی نەمرە، بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بە

ئادەمزادەوە هەیە، سەردەمی گەنجیەتی و جوانی بە رووکەشی بەسەر دەچێ. بەلأم لە راستی دا نەمرە. لەبەر ئەوەیە ئامرۆڤ قۆناغی جوانی بە نەمر دانانێ چونکە ئەو جوانی‌یە رووکەشە لە ناو دەچێ.

- سەباح رەنجدەر لە (بەشداریکردن لە نووسینی کتێبی سەرەتاییتر لە خەون)دا دەیەوێ پۆیێمیکی تازە بابەتمان بخاتە بەر دەست، وەکو دەردەکەوێ بەشی دیکەشی ماوە، هەرچۆنێ بێ پۆیێم دەبێ جێگەو کات و بزووتنەوەو قارەمانی تێدا بێ، ئەمە لەم بەرهەمەدا نابینرێ، لەبەر ئەوە وەکو من هەست دەکەم ئەم بەرهەمە بریتیە لەچەند پارچە شیعرێکی لیریکی چونکە ناوە ناوە سەباح دەکەوێتە ناو گێرانەوەی بابەتێك، لەپڕ بۆ بابەتێکی دیکە دەڕوا، دەتوانێ لە رووی ئەندازیارییەوە ئەم پۆیەمە بکا بە چەند چارچەیێکی لیریکی ئەگەر ترس ئەوەی هەبێ خوێنەر تووشی هەناسە برکێ دەبێ.
- ئەسکەندەر جەلال لە (سەمای دەنگ و مەرگی هێڵە راکشاوەکان)دا، سەری لێ شێواوە ناهەمواریەکان گەلێك زۆرن، نازانێ باسی کامەیان بکا، هەندێکی وا هەڵدەبژێرێ دەتوانێ زاڵ بێ بەسەریانا، واتە لە خانەی واقیعەوە بیانگوێزێتەوە بۆ مەملکەتی ئیستێتکا، لە هی تریش دا مەگەر وشەی کوردی کەم بەکار هێنراو بگاتە فریای و لە قسەی رووتەوە بیانکا بە قسەی جوان.
- چنار نامیق لە (لێوارەکانی وەڕس بوون)دا لە وشەی سفت و رستەی کورت و تەعبیری ئاسایی بەرهەمی ئەدەبی دروست دەکا، پێوەندی لەنێوان رستەکاندا بەهێزە، لەبەر ئەوە خوێنەر بە هەناسەیێکی تیژ هەمووی دەخوێنێتەوە.
- بێکەس حەمەد قادر لە (ئێوارە بوو هەنگاوەکانی خنکاند)دا لە ناوچە دەست پێ دەکا بەلأم تەعبیر لە وولأت دەکا. ناوی هەولێر ناهێنێ کەچی ئەوەی لێی دەدوێ هەولێری‌یە، ئەمە ئەگەر باران بێ یا بەفر، کوکوختی (کۆترە باریکە) بێ یا فەزای کۆمەلأیەتی شار. لەم ناوچەیی‌یەوەیە بوعدێك بە بەرهەمەکەی دەدا بەرەو گشتی‌و فراوانی، هونەری رەسەن خەریکی ئەم جۆرە کارانە دەبێ.
- فاتمە حوسێن پەناهی لە ( سروودێ بۆ خاکە لێوە)دا گێتی‌یێکی رەمزی تەم و مژاوی نەریتی کوردەواری دروست کردووە، بەبێ ئەوەی ناوی نەتەوە بێنێ، بەبێ ئەوەی باس لە ناوی خاك بکا. لە هەموو هەڵسوکەوتێکی ئەم بەرهەمە لە وشەو ناوو وەسف و کەس و تەعبیری داهێنراو هەست بەبوونی خاك دەکرێ، کەسەکانیش خۆمانەن.

- فەرەیدوون سامان لە (ئەهلی کەهف)دا ئەبستراکتێکی قومقومەیی جومجومەیی دروست کردووە. هەرایینکە کەس بە کەس نی‌یە. گەرمای تەمووزی ٢٠٠٠ یا دۆزەخی دوا سالّی سەدەی بیستەم‌ھەوێنی نووسینی ئەم بەرهەمەیە. ئەوەی ئەو گەرمایەی لە هەولێر نەدیبێ ناهەقی نی‌یە لەم بەرهەمە نەگا، بەلاّم ئەگەر ئەبستراکەت (تەجرید) نەبێ. ناوی بەرهەمەکە پێچەوانەی ناوەرۆکیەتی، رەنگە هەر ئەمەش ببێتە هۆی ئەوەی بلّێین جوانە.
- شێرکۆ مەحموود (باوەشی گەرمی ئاو) پێشکێش دەکا. ئەم بەرهەمە لە نێوان (لیریك) و (چیرۆکی شیعری) (پۆیم) دەوەستێ. ناتوانین پۆیمی پێ بلّێین چونکە گیانی دراماتیکی تێدا نی‌یە. ئەگەر (لیریك)یش بێ هەندێ درێژە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەش دا دەچێتە خانەی ئەو پێشەکی‌یە ئەدەبی‌یە داهێنراوانەی کە بۆ شیعرێکی دیاری کراو دەنووسران بەتایبەتی لەناو کوردانی ئێران دا. ئەم جۆرە بەرهەمە لەسەر لاپەڕەکانی (گەلاّوێژ)ی لای ئێمەش پەیدابوو و پێش کەوت.
- سەرکەوت پێنجوێنی لە (لەباوەشی مەهوەشەیەکدا) لە ژێر کاریگەری شیعرێکی کارباییڤـای نۆزبەگستانی ئەم بەرهەمەی نووسیوەتەوە، موناجات لەگەلّ دلبەرەکەی یا خۆشەویستەکەی یا دۆستە نزیکەکەی دەکا. ئەوەی ژنە شاعیری نۆزبەگستانی ووتوویەتی دووبارەی نەکردۆتەوە بەلاّم مانای وەك ئەوی بۆ دروست کردووە، وەك چۆن لە کۆن دا پێنج خشتەکی هەبوو، شاعیرێك سێ نیوە دێڕ شیعری زیاد دەکردە سەر دوونیوەدێڕ شیعری شاعیرێکی دیکە.
- سمکۆ محەمەد لە (برین)دا کۆمەلّێك برین و برینپێچ کۆدەکاتەوە، زۆر ئاسانە پیاو بزانێ برین مانای چی‌یەو برینپێچ یانی چی، بەلاچم وێنەکان ئایا داهێنراوون یا دروست کراوون؟ لە هەردوو حالّەتدا پێش خوێندنەوەی بەرهەمەکە ماناکان لە گوێی خوێنەر دەرزینگێنەوە دەمێ بە هەناسەیێکی رۆژئاواییانەو دەمێ بە رۆژهەلاّتیانە.
- ماریا ئەحمەد لە (خواستێکی ناوەخت)دا سکالاّو پاڕانەوەو موناجاتێك پێشکێش دەکا بە زمانێکی ئاسان بەلاّم پڕ لە رەمزو ئیشارەت. سەرکەوتنی لەوەدایە چونکە نموونەکانی رۆژهەلاّتین و بەنەفەسێکی رۆژهەلاّتیانە هەوێن کراون، ماریا بەسەر نهێنییەکاندا زالّە بۆیە توانیویەتی سەربکەوێ.
- یووسف لە تیف لە (رێژنە)دا هەوروباران و رەهێلّە دروست دەکا، ئەمە دیاردەیێکی سروشتی‌یە لە جوگرافیای ولاّتی ئێمەو دەبێتە سەرچاوەی داهێنانیش، بەلاّم یووسف ئەم دیارەد خۆمالّی‌یەی تێکەلّ بە هەندێ بۆچوونی

ڕۆژئاوایی‌یانی کردووە لە ڕووی جوانی هونەری‌یەوە. دیاردەکان هی ئیمەن و بوزوتنەوەکان هی ئەوانن. بەلاّم بە زمانی کوردی بێژراون.

- سەردار جاف لە (باوەشێنی تەنیایی) شتێکی دیکە دەکا. دەڵێن شیعری تازە نابێ کێش و قافیە کۆنەکەی هەبێ. ئەمە ڕاستە ئەگینا تازەی پێ ناڵێن. هەر ئەو کەسانە دەڵێن لەباتی کێش و قافیە پێویستە ڕیتم و ئەغمەی ناوەوە هەبێ. ئەمە لەم بەرهەمەدا دەبینرێ. لەبەر ئەوەیە خوێنەر دەتوانێ بە ئاوازی شیعری کلاسیکی بیانخوێنێتەوە.
- بۆتان جەلال لە (کەڤاڵێك لە ڕەنگی ووشکایی) دا ئەوە دەردەخا مەرج نی‌یە کارەساتی گەورە لە قەوارەی بەرهەمی ئەدەبی گەورە دابێ. لەم پارچە لیریکی‌یە بچوکە دەتوانرێ باس لە کاری گەورە بکرێ. ئەمە نەك تەنیا ڕۆژهەلاّت بەڵکو ڕۆژئاواش دەگرێتەوە. خۆ دەبێ لەجێ‌یێك دەست پێ بکا، ئەمەش لە چاپخانەی مەچکۆوە دەست پێ دەکا چونکە هەندێ بەرهەمی ئەدەبی کوردی لەوێ لەدایك دەبێ.
- عەبدولقەهاری شێخ (هەواڵ) پێشکێش دەکات، ئەمە درامایێکی ئاسایی‌یە. کچ تێیدا بەدەستی باوك دەکوژرێ. لەویش ئاسایی تر لە کۆمەڵی ئێمەدا ئەوەیە بزانرێ هۆی چی‌یە؟ ڕەنگە مەسەلەکەش لە بنەڕەتدا دروست کرابێ. جوبرائیل فریشتەی سرووش لە ئاسمانەوە گوڵ دێنێ بۆ سەر گۆڕی کچەکە. ئەم کارە گەورە بێ یا بچووك پێویستی بە خوێ و ترشی ئیستێتیکی هەیە.
- فەهد گردەوانی لە (شووشە)دا ژیانی خۆی لە ناو شووشەیێکی بچووك دەبینێ. ئەمە بەشێکە لە شووشەیێکی گەورە کە ژیانی گشتی‌یە، لە ناو زەریای سیمبۆلیزمێکی ڕۆژئاوایی ئامێز مەلە دەکا.
- ئوسامە حوسێن (وەرزی پێنجەمی خەون) پێشکێش دەکا. لەم بەرهەمەدا دیسانەوە ئوسامە پارچە ئەدەبی‌یە ڕۆمانتیکی‌یە ڕەمزی‌یەکانی ساڵانی نێوان هەردوو جەنگی گێتیمان دێنێتەوە یاد بە ترش و خوێ‌یێکی سەردەمانە. ئەم جۆرە بەهەخەمانە دەبێ لە ئەدەبێنەتەوەدا هەبن. جا ئەمرۆ زۆرو سبەینێ کەمترو لە پاشانا پشوودان و دووبارەو سێ بارە زیندوو بوونەوە کارێکی ئاسایی‌یە.
- سیروان ئاشاد بەرهەمی ئەدەبی (تلیسان) پێشکێش دەکا. بۆ ئەمە دەڵێم مەرج نییە قسەی جوان تەنیا لە شیعردا هەبێ. ڕستەکانی ئەم بەرهەمە ئەوەندە درێژن ڕەنگە خوێنەر بە ئاسانی پێی قووت نەدرێ، وێنەو ڕەمزەکانی یەکجار زۆرن، لەوانەیە کارێکی خراپ نەبێ، هەندێ جار بەرهەم پێویستە خوێنەر ماندوو بکا.

- بەهرە موفتی (دەرگاکانی خۆر) پێشکێش دەکا، بەهرە لە ناو گێتیی وون بوون و رەشبینی دادەخولێتەوە. ئەوەی لەناو دنیای بەهرەدا نەژی هەستی پێ ناکا. باوەڕ ناکەم بتوانێ لەم پارچە شیعرە بگا. رەمزی بەهرە لەم بەرهەمەدا ئاسایی و تەقلیدییە، لەبەر ئەوە لە تەم و مژی سیمبۆلیزمی سەردەم رزگاری بووە.
- ئاوات حەسەن ئەمین لە (رووت بوونەوە) دا ئەگەر خەریکی تەعریفی دڵداری بێ بێگومان نەك بۆ ئەو بەڵکو بۆ کەس ناچێتە سەر، چونکە تەعریف ناکرێ و باس دەکرێ. باوەڕ ناکەم ئاوات لەم بەرهەمەدا هەوڵ بدا بۆ ئەوەی بڵێ (دڵداری) دەبێ دوولایی بێ. دڵداری دوو لایی‌نی‌یەو یەك لایی‌یە، لە رووی تیۆرییەکانی سۆفیزمەوە راستە لە نێوان دوو (شت) دەبێ. بەڵام مەرج نی‌یە هەردووکیان بگرێتەوە، بە زۆری دەبێتە یەك لایی و هەر دەمێنێ.
- ئامیق هەورامی لە (دارستانێك لە شمشاڵ)دا دەیەوێ لە بەشێکی زۆر لە تەنگوچەڵەمەکانی هەڵەبجەو گەرمیان بدوێ، بۆ ئەوەی بزانێ بەسەرهات چارەنووس بوو، یا لە پڕو بێ بەرمانە پەیدا بوو. پەنا دەباتە بەر نالی و کامۆو مارکیزو کەسی ترو شتی تر، جا پێویستە خوێنەر بزانێ ئەمانە رەمزی چین؟ ئەگەر نەیزانێ با پلەی خوێندەواری خۆی بەرز بکاتەوە.
- شێروان ئیبراهیم حەیدەری لە (ئەوەی بەجێماوە... تەختە رەشەکانی تەمەنە)دا بەرهەمێکی نوقوم بووی زەریای سیمبۆلیزمێکی دروست کردووە، لەوانەی وەکو عەرەب دەڵێ ( مانا لە ناو دڵی شاعیرە) (المعنى في قلب الشاعر)، من تاکە تاکەو یەکە یەکە دەتوانم لەرستەو تەعبیرەکان بگەم، بەڵام کە بە یەکتری‌یان دەبەستمەوە سەری گلۆڵەم لێ تێك دەچێ، قەیدی چی‌یە ئەمەش با لەبەرهەمی داخراو بچێ.
- نەجات ئەسپینداری لە (سێبەردا) لە گێتیی رەشبینی‌دا دەژی، ئەمە تەنیا کێشەی خۆی نی‌یە هی هەموو کۆمەڵە. نەجات وا دەزانێ لە کۆڵی نابێتەوە، لێرەدا دەیەوێ (سێبەر) بکا بە رەمزی دەسکەوت، ئێمەو سرووشتیشمان ئەگەر سێبەرمان نەبێ بوونمان لە تالووکەدا دەبێ. ئەمەی خستۆتە ناو چەند ووشەیێکی لێکدراوو رستەی سواری لێ دروست کردوون، لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە رەوانی‌و هەناسەیێك دەخوێنرێنەوە.
- عومەر سوڵتان (زەنگ) پێشکێش دەکا، زەنگی ئەو ئەوەی رۆژی حەشر نی‌یە کە هەموو مردووانی سەر رووی زەوی زیندوو دەکاتەوە، بەڵام تۆ بڵێی ئەو هیواو ئامانجانەی کە مردوون لە پلەی رۆژی حەشر دابن، واتە ئەو زەنگەی هیوای مردووەکان زیندوو دەکاتەوە وەکو شەیپووری رۆژی حەشر بێ؟!.

د مارف خەزنەدار

- یووسف عوسمان لە (مەزاری جورجەکان)دا دەیەوێ بڵێ ناهەمواری ژیان لە (وێرانە خاك)ی ئیلیۆت رەنگی داوەتەوە. تەنگوچەڵەمە زۆرە. ئیلیۆت بە گشتی لەگەڵ هەموو سەردەمێك و کۆمەڵێك قسە دەکا. یووسفیش خەریکە وێنەیێك لەو وەردەگرێ، یا وێنەی ئەو شی دەکاتەوەو دەیهێنێتە ناو زمانی کوردییەوە.
- حەسەن مەولوود جاستانی لە (درك چێن)دا بەشێوازێکی ئاسایی و سووك وێنەی ئاژاوەی ناوکۆمەڵ دەکێشێ، بەتایبەتی خراپەکردن بەرامبەر بەو کەسانەی مرۆڤایەتی قەدەغەی کردووە خراپەیان لەگەڵ دا بکرێ، دیارە هۆی ئەمە لەبەر نەبوونی (چارەنووس)ە. ئەمەش کەی دێتە دی، نەمن، نەتۆ، نە ئەو، کەس نایزانێ!
- عەلی مەعرووف شەریف لە (کوخێك لە قوڕ)دا بەرهەمێکی ئەدەبی پێشکێش دەکا، نموونەیێکە لە تەم و مژو رەمز وئیشارەت دوور کەوتۆتەوە، بە ووشەی ساکارو تەعبیری هونەری لەگەڵ مێشك و دڵی خوێنەر قسە دەکا. ئەم جۆرە نووسینانە لە هەموو دەورو زەمان و سەردەم و رۆژگارێکدا دەوریان هەیە، نەك تەنیا بۆ خوێندەواری ئاسایی بەڵکو بۆ خوێندەواری بەرزیش.
- شاهێن تەها لە (چەمێك لە ووشەو شەوێك لە باخەڵی..)دا، هەوڵ دەدا بە کوردی کردنی هەندێ داهێنراوی بەرهەمی ئەدەبی گێتی کارێکی ئاسایی بێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەو بە کوردی کردنە وەرگێران نەبێ، بەڵکو لەلای نووسەر وەك کۆکراوەیێکی گێتی لەناو پێچی مێشکی دا دروست بووبێ و بە زمانی کوردی هاتبێتە دەرەوە.

* * *

ئەمە بە کورتی بیروڕاو بۆچوون و تێبینییەکانم. پیرۆزبایی لە لقی هەولێری یەکێتی ی نووسەرانی کورد دەکەم، ئاواتە خوازم هەموو ئەوانەی بەرهەمیان لێرەدا بڵاوکراوەتەوە بە چاوێکی ژیرانەو زانستییانە پێشوازی لە بیروڕاکانم بکەن.
ئەوانەی بەشداریان لەم ژمارە تایبەتی یەی شیعر کردووە لە کۆواری (نووسەری نوێ) هەموویانم خۆش دەوێ، چونکە گێتی ی ناوەوەی من هەر ئەو گێتی یەیە ئەوەکانی رابردوو و دێرینی مرۆڤایەتی لە شاعیر و هونەروەران کە دروستیان کردووە. لە مرۆڤی ئەشکەوتەوە تا ئێستا. ئەوانەی لێرەدا بەرهەمیان بڵاوکردۆتەوە نوێنەرانی ئەوانن لە هەولێری دواساڵی سەدەی بیستەم و سەرەتای هەزارەی سێیەم و سەدەی بیست و یەکەم.

هەولێر: مەڵبەندی رووناکی      مارف خەزنەدار

١٠ی ئەیلوولی ٢٠٠٠



دڵزار

# قینی گەل

قـاروقینی گـەل بـە جـاریٚ دای لـە هـاڕژن و تـەقین
چەشـنی بورکـانیٚ لـە شـێوەی شۆڕشـێکی ئـاگرین!
ئـاگرێکی بـیٚ ئـەمانی خسـتە خانـەی خوێنمـژان
ژینی لیٚ کـردن بـە دۆزەخ. سووری لیٚ کـردن بـە شـین !
تێکـی دا یاسـاو ڕێژیمـی بـیٚ فـەڕی پاشـایەتی.
تـەفرو تونـای کـرد بـت و هـەم بـت پەرستانی لـەعین!
فەیسـەل و عـەبدول ئیـلاو نـووری نـەیاری نیشـتمان،
دوژمنـانی گـەل بـە دەستی گـەل. لـەناوچوون و رزیـن!

* * *

ئیتحـادی هـاشمی هـەروەك تـەمیٚ بـوو رەوەیـەوە،
هەر کـە تیشـکی رۆژی شـۆڕش رۆشـنی خسـتە زەمین!
بالأخانـەی بـیٚ بناغـەی حیلفـی بـەغدا جێبـەجیٚ،
ژێر بـەرەو ژوور بـوو بەیـەك لێدان و یـەك تیشـەوکوین!

شاو شمعوون و حوسەین و مەندەریس پشتیان شکا،
لەندەن و پاریس واشنتۆن وشك بوون و تەزین!

* * *

با بزانن دوژمنانی گەل بزانن رەنجەڕان،
رابەری ڕێگەی خەباتی میللەتین و نابەزین.
گرتن و لێدان زنجیر کردن و کوشتن چییە،
ئێمە خاوەن بیرو عەزم و باوەڕێکین: ئاسنین!
بەندیخانەی نوگرەو باقووبەو بەغداو کووت،
باش ئەزانن ئێمە کێین و چاك ئەزانن ئێمە چیین!
نابەزین هەروەك نەبەز بووین گەرسەریش دانێین
ئێمە پێشمەرگەی خەباتی سوورو رۆڵەی شۆڕشین

* * *

ئاگرو ئاسن ئەبەد ڕێگا لە میللەت ناگرێ،
هەر ئەبێ بڕواو بگاتە خۆشترین قۆناغی ژین،
ناوی نامێنێ لەمەولا بێ بەشیو رووتیو نەبوون،
کەپرو کۆلیتی هەزاران ئەبنە کۆشك و شانشنین!
ئیش و کارو ژینی سەربەستی لە بۆ هەمووان ئەبێ،
بێ جیاوازی لەبەینی قەوم و هۆز، ئایین و دین.
کۆتری ئاشتی شاپەڕی باڵی سپیو پیرۆزی خۆی
رائەکێشێ بۆ هەموولا، دێتە پەروازو فڕین
ئەو دەمە، ئەو رۆژە کوردیش، کوردی سەپاکی ولات،
دەس لە مل هیوا دەکەین رزگار دەبین سەربەست ئەژین.

کۆیە ١٩٥٨/٧/١٩

لە پێنجەمین رۆژی سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ تەمووزدا گوتوومە........(دڵزار)

# هەوارگەی وێران



غەریب پشدەری

تۆش وەك غەمێ لاپەڕەیەك...
لە مێژووی پڕ کارەساتی، ژیانمدا ڕەش کەرەوە
ژیلەمۆی نێوئاگردانی سادروسڕی...
ئازارێك زۆر دێرینەم، گەش کەرەوە
* * *
تۆش پەڵە هەورێکی ماندووی...
دوا ڕۆژەکانی تەمەنی زەردی وەکو پایزم بە
لە ئاهەنگی ئاودانەوەی.. وشکە ساڵی...
خۆزگەکانما... بووکی شەرمن و زیزم بە
* * *
تۆش بۆ تاوێك، شەن و کەوی...
خەرمانی بەربای غوربەتیم، لەرێ لادە
کا... و کۆت و دانەوێڵەی ئاوارەییم

بە دەستی خۆت .. ئەوەی کە ماوە، بەر(با) دە

*    *

تۆ هاتویتە سەر ویرانەی...
کاولە ئاشێکی جێماو، ئاو لێکەوتە
واتدەزانی... ئارامگەیەکی هێمنی...
پشووی هەناسەدانێك و پێڵوو لێکنانێکی شەوتە..!؟

*    *    *

تۆی شیدای بەهاری تازە...
بۆ رووت کردۆتە هەواری پێدەشتی ئەم گەرمەسێرە
لە پووش و پەلاش بەولاوە، هیچی دیکەی لێ شین نابێ
بەهاری سەوزی ئارەزوو دەمێکە تۆراوە لێرە

*    *    *

چۆن دارمازووی گەندەڵی پیر...
تازە دەتوانێ متوربەی چرۆی دارەبەن بەخێوکا
کەی کانیاوی حەزی دوێنێ تەرو برم...
ئەمرۆ دەتوانێ رووباری وشکی هیوام لێواو لێوکا؟

*    *    *

یان دەتەوێ (ڤان کوخ) ئاسا...
بکەومە بەر شێلکەی قاقای پێکەنینی گاڵتە جارێت
من تۆ لای خۆم... بکەمە عیشقی پیرۆزو بتپەرستم
لای تۆ منیش.. تەنیا بچمە ناو ئەلبوومی یادگاریت!!!

١٩٩١/٥/١٧
دارەتوو

# قوڵغەكان



**ئەنوەر مەسیفی**

**قوڵغێكی پڕ**
**ئاسن شكا**
**واتە قوڵغێكی**
**پڕ شمشێر شكا**
**قوڵغێكی پڕ**
**پایز شكا**
**واتە قوڵغێكی**
**پڕ ڕەنگ شكا**
**قوڵغێكی پڕ**
**ئایین شكا**
**واتە قوڵغێكی**

پڕ کاهێن شکا
قوڵغێکی پڕ
مار شکا
واتە قوڵغێکی
پڕ کاژ شکا
قوڵغێکی پڕ
گا شکا
واتە قوڵغێکی
پڕ کا شکا
قوڵغێکی پڕ
گیا شکا
واتە قوڵغێکی
پڕ شێر شکا
قوڵغێکی پڕ
کۆتر شکا
واتە قوڵغێکی
پڕ باڵ شکا
قوڵغێکی پڕ
ژن شکا
واتە قوڵغێکی
پڕ سێو شکا
قوڵغێکی پڕ
خوێ شکا
واتە قوڵغێکی
پڕ ئاو شکا



٢٨ی ئایاری ٢٠٠٠



# کێ ئەم شارانەی دروست کرد؟!

عەباس عەبدوڵلاّ یووسف

بە قسلْ و کێم
بە زیخ و ریخ
بە قیرو خوێنی تفتیلك و ماسولکەی بەندان
کەلاکی شار بنیادنرا
تەسك و شاش و قۆقز
وەك فیغانی ئافرەتانی سەر بەقوڕ لە فرتەنەیەکدا
جمکێکی جمکوژە
جوغرافیایەکی مێژوو خنکێنە
تیاترۆخانە جێگۆڕکێی دیوەخانەیە
لە بن پردەکانیش
بۆنساردی. گەمەی قەومی لوط دەخولْقێنێ
ڕێك و پێکە!
بتاش لە تەمۆخ کەپی بۆ کردووە
ڕێك وپێکە!
ئیختیار بەر لە مەرگ
بە هەڵەداوان دواتڵپی بەسەر سیلەکانی دارشتووە
ڕێك و پێکە!
ئەندازیار پڕ زێراب و ژێرزەمین و ئەشکەنجەخانەی کردووە.
پارە جادوو دەکات و
بە ماوەر لە سەرکی دینگەکان دەدات

لە سەر بورجەوە. ئەفەندی خۆی داوێتە خوارەوە
هەوا. دەیسەلمێنێ کەوا بێلانەیە
رێی لێ ناگرێت لە دەس خاوەنخانوو خۆکوژی بکات.
باراش ناردە شووشەیە
خۆراکی لەشی عەلمۆدانە
شێشە زێڕ. موغناتیزە.
مارو دووپشك و دزان رادەکێشێت
زبڵخانەی. رەنگینە. کۆمەڵنامەیە
داڵدەی سەگی بەرەڵلای بێ تەسکەرەیە
شار. ناوکی نەبڕاوەی زەمینە

برۆجکتۆری لێیە: ماسییە بەردینەکانی مۆزەخانە ناوس دەکات
قوماشی لێیە: بەسەر لەشی مێیان دادەتلیشێ و دادەخزێ
قەیسەری لێیە: بە جزدان و لنگان قەوغایە
کالیتۆسی لێیە: سەیوانی پەککەوتانە
جادەیان؛ رۆژنامەیەکی مەرگخوازە
خرگەیان؛ چەشنی سەلکە پیوازە
بەرد لە سەر دەرد لەسەر هەردو هەر بەقەرد
شار قیت دەبێ و
شەوگاری پڕ هەقایەتی خانووی قوڕ دەسڕێتەوەو دەبڕێتەوەو
ئالأی شاستانی نەوتیش بەسەرشۆڕی دەشنێ و دەشەکێ.

١٩٧٩/٦/٢

بتاش - بت تاس. پەیکەر تاش
خرگە - قبە
کەپ - لووت
نختیار - پیرەمێرد
شاستان - مملکە
ماوەر - مەترەقی بەردشکاندن
تەمۆخ - بەردی قوماوی رزیو
تەسکەرە - دەفتەر خدمەی سەربازی

# شەویڵ



مەهدی خۆشناو

ئەی راستگۆترین قەدەر
هاتووم برینەکانم بدوێنی
لە زیندان کردنی هەتاوی ساتە بەپەلەکان
لە سندم کردنی (با)ی هەنگاوە بەلەزەکانم
لە لغاو کردنی ئەسپی رۆژگارە پڕ تاسەکانم
هاتووم هەنسکی یوسفی نێو زیندانە ترسناکەکان بدوێنی
شەوە پاکە تاقانەکەم، بە نەمەکترین هاوڕێم
وەرەو ببە زریان، تیژ بڕۆو پێچاو پێچ، ناو دەوەنی بنارو
داو داوی قژی ئەم شاخە هەڵچووە بپشکنە
وەرەو
لە جیاتی سوێی ئەم برینەی من
لە جیاتی مەملەکەتی برینی سۆمای هەردووک چاوانم

لەجیاتی خۆڵەمێشی وێرانەی ماڵی وێرانی برینەکانم
ئاسمان وەقسە بێنە
کوردستان، بۆ ئەتلەسی جوگرافیای
برینی زەردو سوورو مۆری هەردووك چاوانم
ئاگردانی کۆچەرییانە، هەر رۆژێ لە هەوارێ دادەگیرسێ
کوردستان، برۆ کۆتەڵی شەهیدێکی کۆتاییەکانی ئەم سەدەیە
بگەیەنە حزووری مەسیح
کوردستان، وەرەو با وێکرا چۆڕاوگەی
لەبەر رۆیشتووی خوێنی ئەم (مریەم)ە راگرین
شەوە جوانەکە
تۆ چراخانی زیندانە تاریکەکانی
تۆ سپیو لە چێشتەنگاوی رۆژێکی بەهاران دەکەی............ هێندە جوانی!
تۆ لەوەرزی پایزی جوان و خەمناکی
گۆنای پرتەقاڵیی شەقڵاوە دەکەی............ هێندە جوانی!
گێژەنی رووبارێکی سەرشێتیش نیت.
ئەم برینە هەڵدەلووشی............هێندە جوانی!
ئەم برینە نە دەمدوێنی نە وەقسە دێ
ئەمە نەزیفی گەردەنی دارستان و پەپوولەکانە
شمشێری چاخی ئەشکەوتەکان دەیبڕتەوە، دەمبڕتەوە
ئەمشەو برینی رۆحێکی بەستەزمان،
رستە گلۆپێکی هەمیشە سووری داگیرساون
بەبەژنمەوە
نەك هەر دەمکوژن و دەمکوژنەوە
ئەمشەو برینی رۆحێکی غەریب،
رستە گلۆپێکی کوژاوەن بەگەردنمەوە
هەڵواسراون
نەك هەر دەتکوژن، هەزار جار منیش دەکوژنەوە
کوردستان ئەمشەو حەزرەتی (ئیبراهیم) بەو بۆ دواجاریش بێ

لەبەر پێیدا منی (ئیسماعیل) و لەم جەژنی قوربانەدا
وەرن بمکوژنەوە
کوردستان، ئەمشەو برینە ماندووەکانم ڕاژەنە
هاتووم ئازاری غەریبترین برین بە من بسپێری
لە ئەزەلەوە برینە بێدارەکان لە سەر سینگی من،
لە ژێر پێلوی چاوەکانم وەنەوز دەیانباتەوە
کوردستان، تۆ برینە چاو بەخوێنەکانم دەناسیەوە
لەنێو گەڵاڕێزانی هەزارەها برینی وەریو
هەزارەها خەمی ڕەشی تازەی باریو
بێ ئازترین برینی من، لە تۆ بزر نابێ
وەرەو پەنجەت لە پەنجەم هەڵکێشە
لە چرە دووکەڵی ناپاڵمی مەرگی ناوەختی قەڵادزێ و
لە کوڵخانی گڕگرتووی هەناوی هەڵەبجە، دەمناسیەوە
من بوویمە برینە قورسەکانی سەر شانی چەپ و ڕاستت
من ئەم شاخی زام و برینەم لە کۆڵ ناوە
بمگەینە بەر ئەزەرگەی ئەم شێخی تەریقەتەم
ئەی خودایە تاقانەکەم مەدەد.......
مەدەد یا شێخ، مەدەد قوربان.......
ئەمشەو لە هەلقەی زیکرو حاڵی حزوورتدا
زاهیدێکی بێ چارەی بەردەرگام
هۆ برینە داگیرساوەکە
لە سوێی ئێشە قورس و قوڵەکان دەگەم
لە زمانی قسە بێ دەنگەکان دەگەم
لە هاواری کپە خنکاوەکان دەگەم
تێناگەم بۆ ئەمشەو تۆ لە میوانداری من ناگەی؟
هەر ئەمشەو نییە من میوانی برینەکانتم



هەر ئەمشەو نییە تۆ ژانی برینەکانمی
بۆ ئاگری نەورۆزی ئەمساڵیش
چیلکەو پووشی یەکەم کڵپەو
مشتە ژیلەمۆی دانەمرکاوم
من میوانی ناوەختی برینەکانت نیم
بێ ئیزنی تۆش لە هەواری برینت دەمێنمەوە
من لە تۆدا برینم، تۆش لەمن
ئەمشەو لە مێواندارێم تێناگەی!
تۆ نەك هەر مێوانی ناوەختی برینەکانم نیت
من رۆحم بەپێشی هەنگاوەکانتەوەیە
هەنگاوەکانت لەکوێ بن
گەرای تروکانی برینێکی تازە لەوێ دادەنێم
من مەرگم پێش مەرگت دەکەوێ
من برینە سپییە کلو کلوەکانی لێت دەبارن
لە بن رۆحم ژێر دەکەمەوە،
کوردستان، ئەی فریادڕەسی رۆحی پەژموردەم
ئەی خودایە تاقەنەکەم مەدەد ...
مەدەد یا شێخ، مەدەد قوربان ...
لەهەلقەی ئەم زیکرو حاڵەدا فریادڕەسم بە
بۆ برینێکی گەورەی هێندەی مەرگی ئامینەی دایکم،
هێندەی هەموو دونیا فریادڕەسم بە
ببمە قەتماغەو تەسکینی رۆحێکی ماندو
دە فریادڕەسم بە
شەوە جوانەکە، شەوە سپییەکە
ئەی راستگۆترین قەدەر، یا ببە درێژترین شەوی بێ کۆتایی، بەجێم مەهێڵە
یا لەگەڵ خۆتا منیش بپێچەوە بۆ فەنابوون و بۆ هەر کوێ دەچی!؟

١٩٩٩/٣/١٨ هەولێر

# شاعیر



**کەریم دەشتی**

تۆ چاو بەستەی ژێر شەمشێری دیمۆکلیسی
تۆ سەمەندەرێکی تەنهای ئاسمانانی
گۆرانیەکانی خۆت بڵێ و
بچۆرە ناو مەترسیەکانی
تۆ کەڵەمێردێکی تا ئەبەد لە بیرکراوی
تۆغەریبی نێو مێگەلێکی پڕ سامی
تەکانێ بدە برادەر
تا بگەیتەوە ناو سیحری جاویدانی
تۆ کەسێکی بێ نەزیری
تۆ مەخلوقێکی پڕ سەفاو بێ خەڵوەتی
تۆ کوورەکەت بێ ئاگرە
تەنها تری لە زەمینێکی چۆلکراو
تۆ دیرۆکت تاشە بەردێکی بنگۆمە
پێکێکی تر هەڵقوڕینە
با پڵنگی مەستی بتگرێ



تۆلەنێو ئەم خەراباتە
بەتەنها دیدگا شك دەبەی
ئەوان كە ڕەت بوون ترس قوتی دان
تۆ یاریت بە كتێبی خۆر دەكرد
كە ڕەشەبا بینایی داركاژی دەچنی
تۆگەڵا ڕژاوەكانت كۆ دەكردەوە
زۆرم بیر لە تۆ كردۆتەوە
نە ڕۆژێ ویستت مەشخەڵە ئاگرێ بدزیت
نە وچان دەگری لە حەرفێ
تۆ چەند تەنهای ئەی مرۆڤ
بۆ كوێ دەچیت
با تەلبەندێكیش تەی بكەی
بپەڕیتەوە ئەوبەری
یا لە كەنارێ سەمای بێهودەیی بكەی
یا گۆرانیەكی خۆشیش بڵێی
خەمگینی سیمای سەردەمە
گریمان ڕزگارت بوو
ئەوسا كەسێ لە دەوروبەرت نەماوە
دەست لە شانەكانت بدا
هەرچەند ڕاكەی
هەر دەگەیتەوە ڕۆحی خۆت
تەنها تریشی لە جاران
گریمان دەتەوێ سۆراغی كتێبی ڕەهایی بكەی
دەبێ تائەبەد خاچت لە دەست بێ
ئای چەند تەنهای ئەی مرۆڤ؟؟

# دایکم
# کۆچی بە سوێ



موحسین ئاوارە

پێنجشەممە بوو، دەمەو ئێوارە، نزیك گۆڕستان
ژنێکی کۆنە دراوسێمان
- دایکت چۆنە... هەر لەگەڵ تۆیە؟
- نەخێر ماڵی خۆی کردووە.. لەو گۆڕستانە یە وا دەچمە سەردانی
بە وەڵامەکەم بزەیەك کەوتە سەر لێوانی
ئەو هەر بەدەم بزەو رەنگە (پێکەنین)یش، رۆیشت بە پەلە
منیش گلێرەی چاوەکانم لەنێو فرمێسکمدا کەوتنە مەلە
کە دەستم لەکێل گیربوو
وەك ئەوەی دەستم لەسەر سینگی گەرمی چۆلەکەیەك دانابێ
ئەمزانی نهێنییە روحیەکانی خۆم پانتایی چەندە؟
چۆنی پەنهان دەم، قاچێکی لە قووڵایی هەناومدا
ئەوەی دی لە گەردوونێکی نەبینراو

* * *

کە دایکم لە ماڵێکی دی، بە جلی بووکێنییەوە دابەزیوە
دواتر، من وەك سێوێك بە داری تەمەنیانەوە رسکاوم

به یەکەمیانم وتووە دایە
دووەمیش بابە
- ساڵ گلۆر دەبێتەوە وەك باگردێن
وەك ئەو کچ و ژنانەی بۆ نیاز و موورادخوازی
لەسەر مەزاری پیاوچاکان.. خۆ گلۆر دەکەنەوە
- مانگ گلۆر دەبێتەوە
وەك تیرۆگی دایکم بەسەر فەرشەی جێماویدا
- رۆژگار گلۆر دەبێتەوە
باوکی ماندووم بۆ ماڵی دووەم - گۆڕستان - بەڕێ کرا
سات گلۆر دەبێتەوە
جارێکی دی، دایکمی خوازبێنی کردو گواستییەوە
بۆ لای خۆی ماڵی ئەبەدیەت!!
داوای لێبوردنتان لێ دەکەم
پەشیمانی دەمباتەوە بەر دەرگای خەجالەت
پەشیمانی لە پەنا دیواری غەریبان رایگرتووم
ئەی دایە.. نەمزانی ئەو رێگا سەختەی من دەیبڕم
تەمەنی تۆ کورت دەکاتەوە
نەمزانی ئەر خۆشییەی لەدەمی تۆ دەگرمەوە
دەرژێتە کۆشی هەڵپەرستان
هەزار جار مەعزەرەت
چەرخ بە باری چەرخایەوە
خەریکە وەك رەهەندە بەلەنگازەکان پشت لە شارو شارستانیەت کەم
خۆزگە بۆ زەمانی سەردەمانی بخوازم
جۆلا، جاجمی دروست دەکرد
خەرەك دەزووی دەرست
جوتیار بە داس دروێنەی دەکردو لە پشوودانا

جگەرەی لەفکراوی بە (بەردەستیّ) پیّ دەکرد!!

* * *

ئەی ئاگر.. لە زستاندا بۆ گەرمیت دەگەڕێم

لە هاویندا بۆ رووناکیت

ئەی دایە.. لە زستان وهاویندا

باوەشی گەرمت، روخساری رووناکت

بیرەوەرییەکان و کۆمەڵێ ساڵ پێکەوە ژیان

گەرمم دەکەنەوە... پاشان رووناك

دواتر سوتان وسوتان و سوتان

* * *

خەوێکی کاتی خەوتم، لەتەك تابووتە هەمیشەییەکەم

کە بۆ خەوێکی قووڵتر، خەوێکی ئەبەدی ئامادەیە

تابووت، یەك لایەنە منی خۆش دەوێ، بەڵام دوا لانەیە

خەونم دی،

لەو خەوەدا بۆ رابردوو گەڕامەوە

بەسەر یادگارەکانی خۆم داکەوتم

چوار پەراسووی خەیاڵم شکا

دوو باڵم لیّ روا

کاتیّ هاتمەوە هۆش خۆ

خەونێکی کەمخایەنی خۆشڕۆ بوو لەگەڵ تۆ

پیان گووتم...

ئەوەی بە دەستکێشی تەکبیرەوە نەهاتۆتە ئێرە

ئەسپێکی باڵداری تەقدیر هەڵیگرتووە

لێرەدا ساتمەی کردووە

لێرەدا سوارەکەی لەسەر پشتی خۆیدا گلاندووە!!

* * *

ئەی ئێوارەی پڕ نەشئەو غوربەت، ئاسۆی چاو خویناوی
ناحەقی گەنجییەتیم ناگرم. پشتی تێ کردووم، لێم لالووتە
لێی نەگەڕام رۆژێك بە ئاسوودەیی رۆژ بباتە سەر
شەویش بە شیرینە خەو
گەنجییەتیم بەشینیو بە (فەریکی)م خوارد
گەنجییەتیم لەنێوەند مەودای جەللادو سێدارەدا
دوا وێستگەی کۆتە کۆتی دڵە نارەحەتەکەی بوو
ئاگرێك بوو، بەو دەستانەی خۆم دامگیرساندو
نەشمتوانی لەبەری راکەم
ئەو کارە تەڵەیەك نەبوو بۆ دایکم دامنابێتەوە
من رێزم لە هەڵوێستی رووناك گرت
شتێك بوو، کە هەبوو،
ئەگەر زنجیری جەنتاکەم بکەمەوە
هەڵەشارداوەکان هەڵڕێژم
هەڵە شاردراوەکان ئازاد کەم
هەڵە شاردراوەکان هەناسەیان بێتەوە بەر
من وەك پادشایەکی بە غەزەب و دیکتاتۆر
ئەوانیش یاخی بووانی نەترساو
لە سیمی خاردارو لوغم و تۆڕ
گوێچکەم دەگرن و پێم دەڵێن
خەریکە مۆمەکان و (پرۆمثیۆس)یش پەژیوان بێتەوە
ئەمیان لە دڕدانی لەشکری تاریکی
ئەویان لەپێناو دزینی رووناکی
– من ئازادێکی دیلم
سەرفرازێکی رەنگ زەردم
هەنگاوێکی شیرین و هەنگوینێکی تاڵم



لەپشت نیشانەوە
تیرێکی لە کەوان دەرچووم!!

*　　*　　*

ئەی دایە، بە پێوانەیی دووریت... یادت دەکەمەوە
بەپێوانەیی کە چیتر ناتبینمەوە... یادت دەکەمەوە
پێوەر لەگەڵ ماڵی تازەتان لە ژێر زەمین
پتر لەو فرمێسکانەی دانووسان و گڵێنەمیان کردۆتە کەمین
پتر لەو خوێنە پاکیزەییەی رژا بە خۆڕایی لەشەڕەکانی ناوەخۆ
پتر لەو بەڵایانەی تیژڕەو بوون (تیر) ئاسا
بۆ (ئاشتی)یش وەکو کیسەڵ بەکاوە خۆ!!

*　　*　　*

هەموو شتە شەڕانگێزەییەکان رەش دەچنەوە
بە دوکەڵ و باروت و ژەهرو قینی رەشەوە
بەغەزەب و هەوری تورەو رەشەباو
هەڕەشەو خۆڵەمێش و هەشەوە
تەنیا ئەوەی پاکە وەك دڵی پەپولە
رووناك وەك ئاوی کانیو چاوی قرژاڵ
سپی وەك پەمۆو بەفری نوساڵ
خۆشەویستییە
ئەویش خۆشەویستی من بۆ تۆ، تۆش بۆ من
– تۆ وەك خرۆکەی خوێن لە خوێنمدا
وەك ناوکە پرتەقاڵ لە پرتەقاڵدا
وەك چۆرە شیری نێو گوێزی هیندی لە کۆتەکدا
وەك ئەو دوو چاوەی لە کاسەی سەرمدایە
لەگەڵم دای ئەی دایە...
ئەی دایە!!

هەولێر ١٩٩٨

رەهەندە: چۆلگەر. ماڵ بە کۆڵەوە

# سەراب

بەو پوزو رانە گردەوە،
سینگی سفت و هەڵترۆقاو.
بەو بەژنی وا کەڵەگەت و ،
گەردنی کێل و هەڵکشاو.
وەك پسکیتێك
دۆندرمەی کەللە تەزێنی
پڕ لە موچڕك و کارەبا!.
بە هەڵمی دەم دەحەلێنێت و ،
دڵ دەکەیتە
گوانووە پۆلووی
بەر رەشەبا!.
هەروەك بوتڵی پێنج چارەگی
تژی شەراب!
ئەو دەمەی دێم
ئەسپی رۆحی شپرزەمت
لێ ئاو بدەم.
لەم وڵاتە زۆزانەدان
لێم دەبێتە تراویلکە،
سەراب... سەراب !!.



ئازاد دلزار

# شەوەکی ئەبوونەواس

**جەلال مەلەکشا**

چەند کەسێکی سەوداسەری ئاوارەی ئەم جیهانە بووین
لەکەناری دیجلەی چاو بەگریانەوە
شێخی بادە کوورەی زیکری پێ بەستبووین
شاری بەغدا لەخەودابوو
چەند دەروێشێکی ئاوارەو دەرکراو لە دۆزخەستانەکانی ئەم سەر زەمینەو
من و سمکۆو ئەبوونەواس
دەستی دیجلەمان گرتبوو
بەرانبەری شێخی بادە
ئەو ئاوەمان گشت کردبوو بە زیکرستان!
لەوبەر دیجلە
حەللاج هەر بەسێدارەوە سەمای دەکرد
رۆحی شێت و یاخیی ئێمەش
بۆ هەڵفڕین
بۆ گەیشتن بە چارەنووسەکەی حەللاج
خوا خوای دەکرد!



شێخی بادە دەیرووژاندین
هەتا دەهات
کوورە زیکرەکەمان گەرم و گەرمتر دەبوو
دەروێشە ئاوارەکان و
ئەبوونەواسی سەرخۆش و
سمکۆی مەست
منی یاخی لەخۆم و خوا
یەخەی گەردوونمان گرتبوو
دیجلەی فێگرتووش شلَپ و هوڕ
نازانم بۆ کوێنە دەچوو!
شاری بەغدا لە خەودا بوو
شێخی بادە، بەساقیەتی ئەبوونەواس
هێندە زیکری پێکردبووین
هوو هوومان تالای خەلیفە و لای خوا ئەچو
شەرمان شکاند
شێخی بادە بوو بە تیشك و
زوڵمەتی نێو دەروونمانی روون کردەوە
دیجلە بە هاژە هاژ سەری هەڵگرتبوو
دەروێشەکانی خانەقای غەریبستان
ماڵاوایيان لێکردین
ئەبوونەواس رۆچووە نێودڵی عاشقی نەسرەوتم!
سمکۆ خەوت و
منیش تەنیا
سەرخۆش سەرخۆش بەلەترولار
بەرەو ژێردارەکەی حەللاج وەرێ کەوتم!

٢٠٠٠/٤/٢٠ بەغدا

# حەوت چرپە شیعری دی *

**چرپەی یەکەم (نوورو دەیجور)**

ئەو رۆژانەی
شارەکەمان دەیجورێکی کاکە رەش بوو
بروسکی تۆ...
جار بە جارێ شەوقی ئەدا
دەیجوری شار لەگەڵ لێشاوی تاریکی
تاڤگەی نووری لێ ئەباری
لەو ساتەوە
روناکی بە روی روناکیدا هەڵپژا
ئەو بروسکەی تۆرا لە چاوی چوارچرا
جارێکی تر
بۆسۆی تاریکی لێ هەڵسا

**چرپەی دووەم (خۆنەناس)**

تۆی ناو مەملەکەتی‌جوانان
چاوەکانت وەکو کوێرێ
جوانێکی لێیان نەبینی



د.لەتیف محەمەد

هەستت فری بۆ مەملەکەی نەبینراوێ
بۆیە وا تاڵی ئەچێژی

**چرپەی سێیەم (پێ گرتن)**

ئەوەتەی هەم چاوەڕوانم
ڕۆژێ لە گاڵگۆکێ کەوی
ئەترسم هەرگیز نەبینم
ئەو ڕۆژەی تۆ کە پێ ئەگری

**چرپەی چوارەم (مەلێکی سەر براو**

مەلێ دەنووکێکی لە دەستی پاشادا
ماوەی حەوت ڕۆژ کاکی پاشا
تەلەفۆن، و نامە، و هەڤاڵ باران کرا
کاتێ هەللاج لەت لەت کرا
لەکەناڵی هەرچی رادیۆو ڤیژن هەیە
دەنگوباسی چرپە چرپ و
پیاسەکەرو،گوێ ئاگردانیش کپ کرا
لە داخانا
باران لە چاوی دڵ تکا

**چرپەی پێنجەم (یەک ڕەنگ و دوو هێڵ)**

خوێنت ڕژا
یەکێ هات و بوو بە واشە
دەنوکی ڕەشی پێ سورکرد
یەکێکی دی

بەهەمان خوێن
نەخشەی ژیانێکی پێ ڕشت



**چرپەی شەشەم (کوژانەوە)**

ئاگر بە دەستەکەی یۆنان
لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا
بیابان بەبیابان ئەگەڕێ
لەم دەروازەی حەوت ماڵی دا
حەفتا گەداو
حەفتا پاشاو
حەفتا ئاڵا
هاتنە دەرێ یەکێ نەبوو
ئاگرەکەی لەدەست گرێ

**چرپەی حەوتەم (چیا)**

سەری من بڵندو بەرزە
بۆ کەس نەهاتۆتە لەرزە
گەر بینیت ساتێ نەوی بوو
لە ئەندێشەدا چەقی بوو
سەری من و گوڵە گەنمە
سەردانەواندنی شەرمە

* ئاماژەیە بۆ ئەو حەوت چرپە شیعرەی لە هەمان گۆڤاردا ژ (١) بڵاوبۆتەوە.

# تەم و مژ

محەمەد عومەر عوسمان

من هاواری ملیۆن داری...
بەر رەشەبای لە پەل کەوتوو – و هەڵوەریوم
من زایەڵەی ملیۆن مەلی..
لانە روخاو – و تەریوم
لە پەنجەرەی پایزێکی ئەدبەدییەوە
ئەڕوانمە دنیای تەم و
خوێنی رژاوی گەڵاکان
ئەڕوانمە چرای کوژاوەیماڵەکان

*   *   *

ئیسماعیلێکم ئێستاکە... نەك چەقۆی ئیبراهیمی باوك
چەقۆی دەستی دێوی غوربەت سەرم ئەبڕێ
چ فریشتەیەك ئەگاتە هانای زریکەی بەر لەمەرگ و سەربڕینم؟
چ فریشتەیەك گیانداریێ ئەکاتە قۆچی قوربانیی ئەم غوربەتە؟
ئەی خوای گەورە نایەتە دەنگ؟
لە گەرووی کەنیسەکانا..

خنکاوە پەیامی عیساو زایلەی زەنگ
مەسیح هەر بەخاچەوەیە..
ئیسك و گۆشتی لەگەڵ تەختەو بزماری خاچ تێکەڵ بووە..
خوێنی هەڵمی لێ هەڵئەستێ..
ئەی نابینن هەڵمی خوێنی..
چیاو دەشتی سوور کردووە؟
هەوا بۆنی مەرگی لێ دێ..
مەرگ رەشەبای هەڵکردووە



* * *

بۆ جارێ خوا نایەتە دەنگ.
بۆ جارێ خوا نابێ بە رەنگ

* * *

ئابرووی (مریەم)یان بردوو
وێنەکەی وابەدیواری بارو مەیخانەکانەوە
نوقمی ژەهری حەشیشەو توتن و تلیاکە..
گوڵێکی هەڵپروکاوە بەدەست لیکی شەرمەزاریی و
نیگای بەد مەستەکانەوە

* * *

لەو رۆژەوە... قابیل هابیلی برای کوشت
لەو رۆژەوە... دەرگای شەهوەت کرایەوە..
دەرگا لە خوێن کەوتە سەر پشت
لەو رۆژەوە... زەمین خوێنی..
بەردو درەختی بەربووە
لەو رۆژەوە.. خاك بۆ پەیامێکی عیسا..
ئاگر لە جەرگی بەربووە
عیسا خەمە..

عیسا تەمە
گەرچی گەڕانەوەی خەونی هەزارەها رەش و رووت و
دڵی روخاوی ژێر خەمە
کە قابیلی تەرمی هابیلی لە کۆڵابوو
بۆ خوا  قەلەرەشی بۆ نارد؟
تا فێری کا چۆن بیکا بە ژێر خۆڵەوە..
چی ئەبوو گەر قابیل هەر تەمی هابیلی بگرتایە بە کۆڵەوە؟

*      *      *

ئەی سەردەمی قەلەرەش و کونەبەبوو
من ئەمرم و لەناو دەریای دوو دڵیی یا..
شەپۆلێکی دڵنیایی بۆ چی مێشکم ناپژێنێ..
بەسەر تاشە بەردێکەوە؟
شەپۆلێکم ئەسوتێم و نابمە هەڵم
لە دارستانێ تاشەبەرد..
هەڵئەنوتێم و سۆز ئەکەم بە عەزرەت کەنارێکەوە
گشت گیانم لەت و پەت بووە
لەهەر چایخانەو شەقام و بن دارێکا..
پارچەیەك لە دڵم ون بووە
من یوسفم... یەعقوبیشم..
نیوەم لە بنی بیرایەو نیوەم ئەگری
کوانێ نۆقرە؟.. کوانێ ئارام؟
کراسی یوسف بۆ یەعقوب..
یەعقوبێکی ژێر هەرەس و ملیۆنێ زام

سلێمانی شەوی ١٩٨٣/١١/٢٨

بەشێکە لە چامەیەک

# نیشتمانێک لە شووشە



بە یەکە یەکەی ئافرەتانی وڵاتەکەم پێشکەشە

**نیگار نادر**

لە پڕ لە زرینگە زریسنگی خۆم رادەچڵەکیم
دەمدیت بەرداخێکی کریستاڵی بریسکەردارم
لەنێو پەنجەکانی بازرگانێکدا پڕ پڕم لە شەراب
لە سەر لێوی هەر سیاسییەکی دۆڕاو پڕ پڕم لە خوێن
چ رەنگێك هەیە لە خۆمم هەڵدەسوو
جغارەیەکەم دادەگیرساند و
دونیام دەکێشا
لە پڕ گەرم گەرم لە چاوی ژنێك دادەخزیم و
بەسەر رومەتەکانیدا
بە ناو دەزوولە دەزوولەی هەناویدا رێم دەکرد
گەلێك دەمان هێندیان گوڵ تێدا چاندبووم وڵاتم بە سەر گوڵان دەگێڕا
کەس نەبوو لەگوڵەکانی منی بەسەرەوە نەبێ
لە گوڵەکانی منی لە یەخە نەدابێ

بەیانیان زوو دەپشکوتم هەموو ژنەکان دەگەڵم دەپشکوتن
لەسەرتاسەری وڵات دەپشکوتین
ئێواران پڕ پڕ دەبووم
لە کۆترو تیایاندا دەگماندم
کوند لەسەر پێیەکانم هەڵدەنیشتن
قازو قولینگ لە زۆنگاوەکانمدا مەلەیان دەکردو
خۆیان لە ئاوەکانم هەڵدەکێشا
زۆر جاران پەیکەرێکی رووتیان لێ دادەتاشیم،
لەسەر مێزی گەورەترین بریار دایاندەنام
دەسك دەسك لە سەر مەزاری شەهیدێکیان دادەنام
هەموو دەمان تێکەڵ و پێکەڵیان دەکردم و تێکیان دەدام
تا بۆیەکی خەست خەستیان لێ وەبەرهەم دەهێنام،
زۆر بریقەدار شیعاری گەورەترین حیزبیان پێ دەنووسیم
لە لافیتەی مردووەکانیان هەڵدەسووم
دیوارەکانی ئەوینیان پێ سوور سوور دەکردم
رەشرەش لە پۆستاڵ و لە پێڵاوی گەورەکانیان دەدام
بە ریز راوچی قولابیان لە دەریایەکانم دەهاوێشت
جۆرەها مەلەوان خۆیان لە کەنارەکانم فێر دەکرد
هەموو مەلەوانەکان بۆ مرواری و زمرود بە بنی ئۆقیانووسەکانمدا هاتوچۆیان
دەکرد
دەرگای هەموو کلێسەو مزگەوتەکانیان لەمن دادەخست

* * *

شەوان رەش دادەگەڕام بە ملیۆنەها ئەستێرەم لێ وەدەردەکەوتن
سبەینان بەرۆکم دادەچەقاو
خۆرم لێ بەدەر دەکەوت
هەمو هەورەکانیشم بە خۆوە دەگرتن

له چوارچێوەیان دەگرتم
له چوارچێوەی دار
له چوارچێوەی زێڕ
یا به دایك.. یا به منداڵ... یا بەسەرکردە... یا به خۆشەویست به دیواریان
دادەکردم
لەپڕ لەنێو ڕۆحی دارهەنارەکان وەشنە شن دەکەوتم
مووەکانم شه دەکردن
وەك گوڵدانێکی گەورەو ڕەونەقدار له دیوەخانی ماڵێك.. له دیوانەکانی
سیاسەت. له سەر مێزێك
له شووشه بەندێکدا ڕایاندەگرتم ...
وەکو شەڕاب له شوشه مل باریك و قازاغ قازاغدا ڕایاندەوەشاندم
له قەسابخانەکانی شاردا دەگەڵ کەلاکی گورگێك، مەڕێك، به یەك شیشەیان
دادەگردم
به حەپەساوی ڕام دەکرد غارم دەدا بەسەر پەرژینەکانی ژنیەتی دەکەوتم....
به نێو لیتەکانی ژنبوون دەکەوتم
کێهە ئەندازیاری شارەزایە گازیان دەکرد ،
پتەوترین باڵەخانەی سیاسەتیان له سەر ڕۆدەنام...
تەلبەندیان دەکردم منداڵەکانی هەموو دونیایان تێدەکردم
باخچەی گەورەو بەرین...
قەفەزی گەورەو گچکه جۆرەها ئاژەڵیان تێدا بەند دەکردم...
ناڵبەندی کارزانیان له چەند وڵاتانڕا دەهێنا ناڵیان دەکردم
به زێڕ به زیو به ئاسن ، به نەخشی جوان ناڵیان دەکردم
کارامەترین ئاسنگەریان دەهێنا
به سەدان دەرگاو پەنجەرەی پڕ شیشیان بۆ دروست دەکردم
له پڕ قاقام دەکێشا
به نێو هەموو کاتژمێرەکانی تەمەن دەکەوتم

بە تۆپ قوماشیان دەهێناو تێیان وەردەگرتم
بە ئاوی هەموو چۆمەکان دەیانشووشتم
بە نێو مزگەوت و تەکیەو بەهەشتەکانیان دادەبردم
ناسنامەی پاکیزەییان دەدامێ و دەستیان زیارەت دەکردم
یا بەمقەست دەیانبڕیم... یا بە دەست لەت و پەتیان دەکردم
جۆرەها چەفیەو لەچك و رووسەرییان لێدروست دەکردم
پرچی هەموو کەنیشکەو حورمەکانی ولأتیان پێدادەپۆشیم
یا لە گەورەترین مەراسیمدا میدالیای کەرامەتیان بە یەخەوە دەخستم
تاجی شەرەفیان لەسەر دەکردم

* * *

گارۆیەکی قشتیلە بووم دارێکم کون دەکرد
هێلانەم تێدا چێ دەکرد
چاوێکم کون دەکرد هێلانەم تێدا دەکرد
رۆحێکم کون دەکرد هێلانەم تێدا دەکرد
هەموو گیانیان دەکردمە هێلانەو لەسەر هەموو درەختەکانی دونیا هێلانەیەکم دەکرد
زۆرجار تۆرێك بیرهەڵکەنیان وەسەر دەخستم
قووڵترین بیریان لە مێشکمدا لێ دەدا، نەدەگەیشتنە تنۆکێك عەقڵ
قوڵترین بیریان لە دڵمدا لێ دەدا
نەدەگەیشتنە تنۆکێك خۆشەویستی
قووڵتریان بیریان لە چاوانم لێ دەدا
نەدەگەیشتنە قەترەیەك بینایی
قووڵترین بیریان لە جگەرم لێ دەدا
نەدەگەیشتنە دڵۆپێك منداڵیەتیم
قووڵترین بیریان لە سیەکانم لێ دەدا
نەدەگەیشتنە گەردێك لە هەناسەم



# بەئاو خنکاندنی نەهەنگ



محەمەد باوەکر

لە ئێوارە شەوێکی شێواودا
خورتی ئەسپە دەریاییکی سپیم پەڕیێ
دەسنوێژ گەڕایەوە
تا مەزرۆیەکانی روسایی ژنە شاتانێك
لێستمەوە...
تێك ئالأین...
گەڕیدە هێزێك لە مەلەی ئەو دەریایەدا
نغرۆ بوو
تێك ئالأینەوە
نەهەنگی جۆشەنەدار سوار زەلامانە
گەڕاینەوە زێ،
کێوییەك فالی هاتێ
دونیا لە بەرامی بۆنی پشیدا خۆی نەدەگرت

موچرشكی لەزەتەكانی نەهەنگ
لە لەزەتدا خنكان.
نەهەنگ چەندە شەهوەت مرازە
چەندە مرازی شەهوەتانە
ئەم و ژنە ئەسپیندارە
چركەیەك لە مەشخەڵی ئەبەدیان دامركاندەوە
بە ئاویان كوشت.
بەفرە رەشێكی شەڕەت لەسەر سەماگەی سەكۆی خەوتندا
بەلەسەیە
مرۆیە ئەگریسەكانی گەیاندە سەر كۆلێكی بەتاڵ
لەو بەر بازنە كەنارەكانەوە لێت هاتنە پێش
بەرۆكیان گرتیت... تاوانەوە لە تاوانەوە دا
حەبەكانی ئاوڵمە كوژێش گەیشتنە ئەشكەوتێ
تۆ بە گەرو وشكیو چوار لەپانە
هاتیتەوە.
كیفكە ئاو ئەدزەكان.. ئاویان دزی
فێڵی خۆیان كرد
بۆ تۆ دیسان بارگرانی هەراشبوونی جوانەمەرگێكی زیندوو
لاواندنەوەی شیوەنی یەسوعێكی تری خستە كۆڵتەوە.
ئەم داوەبەنەی قاچی پێپێورا...
ئەم داوەبەنەی قاچی كردەوە...
دەبەر پێپەتیەكانی زیخ هەڵنەكشاوە.
لەگەڵ ئازارەكانی پێ دۆستیت
ئەو ساوایانەی لەوەختی سازدانی زایندەیەك
گاشەیان بە سوڵتان شوبهاند
كرانە سێرە تۆنترەقەی بزدانە كارخانەی هاومۆرەكانی خۆتانەوە

مخابنە لە من خاینبی.. کرپە.
ئەوە رمبەی حەز لە خۆ کردنە
یانەکێنیٚ لە خۆ رەوینەوەیە
هیچ شتیٚ چاوەنۆڕیت ناکات، ئەو لانەوازە
هیچ شتیٚ جۆشی نادات
لەو پووشە وردبوونەتەوە، چۆن وشك دەبێت؟
کەچی دەچێنری؟ کەی دەدروێتەوە؟
مامۆتکی شاری گوندو گوندی شار دەیگوت:
شای پەریان بەخوانووس کەوتە سەر برای گچکە
بستە بالآیە بیٚ ولآتەکان
بەرەچەی برای گەورەن.
خۆ رەشمالٚژینی دەم ئاوان نەبوویت
دەنا ناموسی دەریا داتەکینە
با بەرەچەکان لە رۆخیان بروێن
هەلٚبەتە بە تیٚراوی نەشونما دەکەن و
دژایەتی لە گەرما وشکی هەلٚدەگرنەوە.
نا.. نا
پزدانە پشو دراو.. عانەی قەلٚپ
ناسیاوی یەکترین
سەفەر بەر زووهەلچگری شاری شەمولەیە
پریاسکەی لە باخەلٚی هەمووماندا هەیە
لە تەکمان دەخەوی...
لە تەکمان دەڕی..
دەوباتە ژینگە روتەلآنی قاژووان
لەوێش بۆ گۆشتە تازە گەیوتان دەقیژێنی.. بەیادی
زیندوو بوونەوەی قالۆنچە نەمری چاوو زارە



# "حنین" دەسکوژی

گوڵەکان
دەبەمەوە شێخی چۆلی
لە ژوور سەری گۆڕغەریبەکە
بەرداخەکە پڕ دەکەمەوە لە رەشەڕەیحان
پێش زەردەپەڕ
تەقسێك بۆ گریان
تەقسێك بۆ رەشەڕەیحان.. ساز دەدەم
فریشتەیەکی باریکەلە
کە لە رەنگاڵەیەکی باڵشکاو دەکات
دێتە سەرشانی تەپوتۆز لێ نیشتووم
سەربوردەی مردنێکی رانەگەیەنراوم
بۆ دەگێڕێتەوە، پێمدەڵێ:
– هەی غەریب خۆت.. لە مردن خۆشتر مردنە!



نیسماعیل بەرزنجی

*   *   *

گوڵەکان
دەبەمەوە بەغدا
لە ژێر کالیپتۆسێکی رەبەنی حەدیقەی زەورادا
لە پایزی هەموو ساڵێك
سەمایەك بۆ کەف
بالێیەك بۆ مژین.. نمایشدەکەم
فریشتەیەکی باریکەلە
کە هەر لە تەوارێکی بریندار دەکات
لەسەر ناولەپی شەقارشەقار بووم هەڵدەنیشێ و پێمدەڵێ:
– لە مردن بەرزتر... مردنە!

*   *   *

گوڵەکان
دەبەمەوە سلێمانی
لەبەردەم وێرانەکەی حەسیب ساڵحدا
دەیانێەم لە یەخەی کیژە گەرمیانیەکی قژلول
لە ژووری ژمارە (١٠٤)ەوە
فریشتەیەکی باریکەلە
کە لەمامزێکی زامدار دەکات
خۆی لە جەستەی سادروسڕم هەڵدەسوێ و پێمدەڵێ:
- لە مردن جوانتر... مردنە!
* * *



گوڵەکان
دەبەمەوە ورمێ
لە گولاوە خامۆشەکە
خۆم نغرۆ دەکەم
فریشتەیەکی باریکەلە
کە هەر لە ماسییەکی خنکاو دەکات
سەراو دەکەوێت و پێمدەڵێ:
- لە مردن پیرۆزتر... مردنە!
* * *

گوڵوکان
نابەمەوە سوید
تا نەبنە خزمەتکار
نابەمەوە ئەڵمانیا
تا فێرە حەشیشە نەبن
نابەمەوە ئەمەریکا
تا نەبنە چەتە
نابەمەوە دانیمارك
تا نەبنە پەنیر فرۆش
گوڵەکان
هەی گوڵەکان
لەگەڵ خۆم دەتان نێژم!

ئابی ٢٠٠٠

# سەمای هەرزەکاری



گولاڵە حوسێن

- ژنێکی هەرزەکارم
لە باڵای وشەکانت
خۆم دەئاڵێنم
سپیترین خۆشەویستی لە ژێر ئەم
ساباتە سپییە
توند بگرە
ئاشنام بە بەربوونەوە
- بەربوونەوەکانم
لەگڕ کفنان دەچنن
شووشەی پڕ
لە دۆڕانەکانم هەڵدەهێنجنن
لە پاشان بە ڕووی ڕۆژە
پیربووەکان پێدەکەنن
پشتم پڕ ترس دەکەن

- نازانم
ئاوازی بەربوونەوەکانمە
بە سەمام دێنێ و تەنیاییم
دەلاوێنێتەوە
یان
هەڕەشەی تشرینە دامانەکانم
دەقرچێنێ
یان
سەما بەفرم
تشرین دەمچڕێ
هێشووە بەفر دەگرم
گۆرانییەکانی بەربوونەوە
دەڵێمەوە
- بەربوومەوە
لەتێك پێکەنین و گریان و
سروشتم
ڕوخاند
بەرامبەر جیهانێك لە
ڕێز
- کە بەربوومەوە
لە قژە سپییە کریستالییەکەت
پردێکت چاکرد
بەرەو بەهەشت
خۆشم دەوێی



# تارمایی و سێبەری بوون



**رۆستەم باجەلان**

شەو، بەپێچەوانەی رۆشنی مۆمەکەم بە قورسی هەڵدەوەرێ
شەو، بەپێچەوانەی ژەمە خۆراکی ناو سکم بە قورسی هەڵدەوەرێ
* رۆشنی مۆم کوژایەوە
تارماییە من و بەرجەستە بوونەکانی ژووری لێ کردم بە نەبوون
ئێستا ژوورەکەم لەم گەدروونە دەکا
فرە نهێنی شاردراوە لە ژێر باڵی تاریکیدا سەرهەڵدەدا
- فەلسەفە، میوانێکی گوزارەیی ئەبەدییە
- منیش وەکو مۆمی ژوورەکەم هە ڵدەوەرێم
هۆکاری کەش گەشترم دەکا، هۆکاری کەش کزترم دەکا
ئێستا ژوورەکەم لەم گەردوونە دەکا
گەردوون کۆنە، بە قەد مێژووی کۆنیی گەردوون گۆڕانکاری لە سەر ئەم زەوییە روو دەدا
فرە بوونەوەری بەرجەستەی توواوە،
لقی تازەی لێ دابراوە
- حاجی لەقلەق لە حوشتر دەکا، هەڵۆش لە پڵنگ
داکەمارانەو خوشك و براکانی لەداێناسۆر
ئەی منی پێست سپی و رەش و سور
دەبێ تارمایی و سێبەرم لەگەڵ کامە بوونەوەر تێك کاتەوە:

(مەیمون، بارانبڕە، شەمشەمەکوێرە، توتی یان ...؟)
شەو دەڕواو خۆم دەدۆزمەوە
ئەم حاڵەتە نائاساییەی تێی کەوتوومەش
وەك ئەو شەو، وەکی ڕۆشنی ئەم مۆمە، وەکو منی تارمایی و سێبەر
لە هیکەوە هەڵدەورێ، دووچاری حاڵەتێکی دیکەم دەکا
وەکو چرکە هەر رادەکا
هەر بۆ ئەوەی سوار شەپۆلی خەیاڵ دەبم، بەرەو دونیای ئەودیو یۆتۆپیا
سەفەر دەکەم، هەر رادەکەم
هەر بۆ ئەوەی من لێرە بێزارم،
لێرە مرۆی مەقەوایی هەیە،
فلچەی پیتۆڵ دەتوانێ لەجیوە رەنگی کا، بە ئارەزووی خۆیەوە شەنەبای کا
دەتوانێ: دەنگداری کا، بێدەنگی کا، بێ رەنگی کا...
تارمایی وسێبەری بۆ دروست کا، تارمایی و سێبەری لێ ون کا
- تارمایی و سێبەری سیی و هەشت ساڵەی تەمەنی بوونم لێم ناترازێن
نەدەگیرین، نەبۆ رۆژێکیش لێم ون دەبن
سیی و هەشت ساڵە خۆم خۆش دەوێ، تارمایی و سێبەری بوونم دەوێ
سیی وهەشت ساڵە هەر یەك شەوە روخسار گۆڕە.
هەمان ڕۆژە روخسار گۆڕە
شەو ڕۆژ لەگەڵم گەورە دەبن، دەبن بە حەفتە، بە مانگ، بە وەرز، بەساڵ دەبن
بەدەیان ساڵ و هەزارانیش
من و منەکانیش، لەنێوان ئەم فارگۆنە ساڵە مکیاژ کراوانەدا
کۆتایی بە تارمایی و سێبەری بوونمان دێنین
سیوە سیوەی پەسێوی پەناگەمان جێ دەهێڵین
بە هەندێك شت زیانبەخشین، بۆ هەندێکیش گۆڕانکاری تازە دێنین
هەر بۆیە، ئەگەر کەوشی نمرە چل و دووی دوا مۆدیلی سەردەمیش
لە پێی پێخاوسی منداڵیم هەڵکێشم

- یەك پێ
- دوو گوزەرانی ناو رۆژگارێ
ئەم دووانە، دیسانەوە لە یەکتری گیر دەبنەوە
ئەم دووانە، جیهانیی منداڵیی پڕ لە پەلکە زێڕینەیی زەردەخەنە، ژینی لێخنی ئێستای منی لە تاڵی نزیك بوونە وەنە
سێبەرو تارمایی، تارمایی و سێبەر وێنەی خەیالاچویی منن
لەگەڵ منیش بزر دەبن
سێبەری جیهانی منداڵیم، تارمایی رۆژگاری تا ڵیم هەڵدەوەرێن، بزر دەبن
ماڵئاویی لە جولانەوەی جەستەم دەکەن
دەبمەوە خاك، دەبیەوە خاك، دەبنەوە خاك..
بۆیە خۆم خۆش دەوێ، بۆیە تۆم خۆش دەوێ...
بۆیە چاوەکانم پاسەوانی ئەم شارە لەبیرکراوەن، کە ئەومنداڵە لێی دەگەڕێ، دەگری‌و ژێر نابێتەوە
رۆڵە مەگری!
هەر بۆ ئەوەی لە منداڵییەوە دار شەکرۆکم بینیووە
لە ئاقاری ئاوای دەروونیم هەڵکۆڵیووە
رۆڵە! دار پشیلۆکەش لەگەڵ منداڵان تەبایە
پەپوولە پایزەی رۆحی لە چوار دەوریان ئالأیە
ئەها! رۆح ماڵئاویی لەجەستە کرد، یەسوع بۆ ئاسمان هەڵفڕی
پەپوولە پایزە یەسوعەو یەسوعیش نییە، هەر بۆ ئەوەی رەشەبای پایز توانای نییە هەڵیوەرێنێ، بیبەزێنێ، بیتۆقێنێ
لەبن و بۆتکەوە هەڵیتەکێنێ
- پەپوولە پایزە زەوی جێ ناهێڵێ
- بە ناو ماڵەکانەوە دەگەڕێ
- منداڵانی خۆش دەوێ
پەپوولە پایز یەسوعەو یەسوعیش نییە

هەربۆ ئەوەی حەزی لە یارییە، وەکی منداڵان بێگەرد وسپییە لەناو لەپی
ئەوانیش دەتوڵخێتەوە، بۆ ئەوەوی لەسەر زەوی بمێنێتەوە
لە روخساری خۆی قوربانی تۆمار دەکا، تارماییو سێبەر شەنەبا دەکا
بژی پەپوولە پایزە، بژی پەپوولە پایزە.
رۆڵە مەگری!
من دەزانم فرمێسکەکانت لە پەڵە هەوری سەرەتای زستان دەکەن
روویان لە وێرانە خاکە
تۆ ئەو پەڵە هەورەی، بای بارانیش داکە، لە ئامێزی کردووی
بای باران پەروەردەی کردووی
من دەزانم بە باوەڕن هەموو رۆژی پرچت بە چپۆکی شانە دەکا
بەد وواتەوە رادەکا، چرنوك لە حەزەکانت گیر دەکا
من دەزانم (با) هەربایە، بەڵام سیماو دەنگی جیایە
من دەزانم ویستی ئەم مرۆیە لەبەرژەوەندیی نیوەی کۆمەڵە
ویستی ئەو مرۆیەش لەبەرژەوەندیی نیوەکەی دی
من لەنێوان تارمایی و سێبەری ئەم دوو رەنگە سەرقاڵم و
بە غەریبی هامووشۆ دەکەم، من لەنێوان تارمایی و سێبەری
ئەم دوو رەنگە سەرقاڵم و هەقیقەتە پەیکەری مرۆی ئێرانەیی دروست دکەەم
بۆیە رۆڵە لە مێشکما نەخشەی وڵاتی بەفرستانم بۆ هەڵگرتووی
لەگەڵ خەیاڵم گەورە دەبیٚ، لەگەڵ تەمەنم گەورە دەبیٚ..
رۆڵە مەگری!
گەر سەرماتە ئاگرێکی بەجۆشت بۆ دەکەمەوە، گەر گەرماتە
چ سەرچاوەی گەرمی هەیە لێتی دوور دوور دەکەمەوە؟
گەر هەست بە ئاسوودەگی ناکەی داڵدەیەکی ئاوارەییت
لەلای خۆم بۆ دەبینمەوە.. برسیت بیٚ، ئەوا
کولێرەت بۆ دەهێنمەوە
رۆڵە مەگری!

ئاگر، بای کوێستانان، نان
هیچ یەکێکیان جێ پێی حەزی ئەزێتیم ناکەنەوە
ئاور لە ئارەزووەکانمان نادەنەوە
رۆڵە مەگری
نە من لە زمانی تۆ دەگەم، نەتۆش لە جیهانی منی نیگەران
من لەناو ئەو بەلەمەوە ملی رێی دەریام گرتووە
- قەراغی رێ بۆنسۆی لێ دێ، قەراغی رێ لەبەر چاوم ون دەبێ
رێبوارێکی ئەم جیهانەم
هەرکە دەگەمە دەریاوە
تارمایی و سێبەری تاڵی‌و سوێریی لێ روو دەکەم
رۆڵە، لە کانیی بەرتاوڵی کۆچەران دەکەی
ئەو لەکەناری گیاوگۆڵ و گوڵە کێویلە پەرش دەکا تۆش
لەوەرزی کورپەی چاوگەشی تارمایی و سێبەر بەرەو پیرت را دەکا
رۆڵە مەگری!
من لەنێوان ئاوی کانی‌و ئەشکی تۆدا ترپەی زەمەنی ژینم بەتاڵوکەیی بەرەڵڵا دەبێ
ترپەی زەمەی ژینم خەفە دەبێ، خەفەش نابێ، تۆش وەکی من
- زەمەن دەرواو تۆی منداڵیش دەڵێی منی ترپەی زەمەنی ژینت بەتاڵوکەیی بەرەڵڵا دەکەی، بەبێ ئارەزووشت
لەدووای گالیسکەی تارمایی و سێبەرم رەو دەکەی
ژمارە ترپەی زەمەنی ژینت لە ژمارەی ترپەی زەمەنی ژینم کەمترە
دانیشتنت لە دانیشتنم خۆشترە
دانیشتنم لەدانیشتن بەجۆشترە، لێکیش دانابرێین
تارمایی و سێبەری ئەو کانییەش جێ دەهێڵین
رۆڵە مەگری!
ماڵئاویی لە خاك كردن دەردێکی گرانە

كه خۆر بۆ چەند كاتژمێرى جێى دەهێڵێ
لەد ووا چركەى بزربوونى گشت گيانى دەبێ بەبرين
كه بەفر بۆ چەند مانگێ لێى دادەبڕێ
له حەژمەتان دەتوێتەوە، دەبێ بە گرين
كەمن و تۆش جێى بهێڵين گڕى خۆشەويستيى ئەم خاكه ئەوەندە
بەتاوە هەر لەم ناوە دەبين بە خۆڵەمێش
جارێكى تر هەروەكو خۆر، وەكى بەفر، وەكو گەڵا، وەكى چرۆ
ناگەڕێينەوە سەر دۆخى جاران، بەهۆى تارمايى و سێبەرمانەوە
جارێكى تر دەورى هەمان ئەكتەرى پێشوو ناگێڕين، نايەينەوە سەر رووى زەمين...
رۆڵە مەگرى!
هەر بۆ ئەوەى دڵنيامە رۆژێ تۆش كڕ دەبيتەوە
منيش لەهيكڕا جێت دێڵم
رۆڵە، دونيا شانە مێروولەى ناوە
رۆژگارە مێروولەش سەريان لەدوواى يەكدى ناوە
له روخسارى ئەم شانە مێروولەى دواى مەرگما دەمبنيەوە
دەمبينييەوەو دەمانسييەوە، دەتبينمەوەو ناتناسمەوە
– ئەو منداڵە تۆى، ئەو منداڵە ئەوە، لەم شەقامە چاوى بەم وێنەيە كەوتووە
كه بە ديوارى شارەو هەڵواسراوە
ئەو رێبوارەش منە، منەكانە
ئەها! ئەو ديمەنەى بينى
له فرمێسكى چاوانى ئەو منداڵەوە بۆى روونبووەوە
خاوەن وێنە رۆژێ بەهاناى هاتووە
بەڵام بەهۆى مەرگى كتوپڕەوە ماڵئاوايى لێكردووە
تارمايى و سێبەرى جەستەى جوڵێنەرى لەزووێكەوە
رەش بوونەتەوە
ر ە ش ب وو ن ە ت ە و ە



# ڕەنگە تیرەکانی (من)

حەمە عەباس

## داڵغە

من نیم کە دەمەو ئێواران پیاسە بەشەقامەکاندا دەکەم
گوڵی باخە بەهەشتییەکان بۆ یەخەی خۆم دەڕنم و
شەوەکان لە چراخانی پڕ لە سەرمەستی جێدێڵم
من نیم.. ئەوە من نیم

*    *    *

لەسەر ڕێگاکانی سەفەر گوڵان دەشنێن
با گوڵێکیش لەسەر ڕێگاکانی چاوەڕوانیا بخەندێ
گوڵی خوێن و دڵ و سێبەر
کامیان بۆ کامیان تەلأقدەم

*    *    *

داگیرساندنی چرایەك ڕەنگی هەناسەیەك دەمژێ
هەناسەکان سنوورەکان جێدێڵن و

سنوورەكانیش هەموومان
خوا لە چاوە نوورانییەكانی ئێمەوە
مەراقێكمان بەسەردا دەبەشێتەوە
كرمی نەڤینێك لە سەرماندا دەبزوێ و
شەڕیش بەسەر چارەنووسمان باوێشكێك هەڵناوەرێنێ
من لەرزەتی تامە نەچەشتووەكانم لەرۆحی خۆم هەڵدەمژم
ئەو رۆحەی رەنگەو رەنگیش نییە
بە رێكەوت جڵەوی جەستەمی گرتبێتە دەست
ئەی رۆح بەسە ئیتر ببە بە خۆم
ئەی خۆم بەسە ئیترمۆمێك بە چەتری سەرتكە
ئەی سەر تۆ كە ڤایرۆسی شەڕو نەڤینت لایە
گوناهێك كاڵ ناكەیتەوە
ئیتر من و تۆو ئاشنایی
چ مانایەكی بێ مانا

## تەنیاییەک لە خۆی دەچێ

ئەم دەلاقە بچكۆلەیەش بەسەر تەنیاییتا داخە
تا ئەوپەڕی بێهودەیی بدوێ
بێدەنگبە هەتا ئەمپەری بێهودەیی
ئیتر بەم زمانە جارانییە
ئەم مەتەڵی ژیانە ناخوێنرێتەوە
دەستی ئەم تەنیاییە بگرەو
بە كۆڵانە سیحراوییەكانی ئەوێدا پیاسەیەكی دووقۆڵی بكەن
لەگەڵ تۆمە ئەی من
ئەوە بۆچی هەر هیچ نەبێ سەرێكم بۆ ناڵەقێنی

هەر هیچ نەبێ - نا - یەکم بەروودا نادەی
هەر هیچ نەبێ چاوێکم لەگەڵ خۆت نابەی
تا لە تەزووی لەززەتی تەماشاکانی
تریفەی مانگ و بارینی نەیزەکەکان بێبەش نەبم
ئەوێ وڵاتێکی خۆشەو من نایگەمێ
دەستی ئەم تەنیاییە بگرەو بڕۆ
چاوێك... گوێچکەیەك.. لوتێکم ببەو بڕۆ
وا درەختەکە وشك بوو
گەڵاو کەنارییەکان فڕین
سیحری جوانییەکان بەتاڵبوو
ئیتر بەدیار چییەوە رامێنین
کە ئەم دەلاقە بچکۆلەش بەسەر تەنیاییت دانەخەی
ئیتر چی...!



## بۆ تۆ ئەی مەرگ

شەوت باش ئەی خواوەندی خەو
من هاتووم بۆ لایلایەیەك
سپێدەت باش ئەی کازێوە
من هاتووم بۆ چەهچەهە یەك
مردنت باش ئەی عاشق
من هاتووم بۆ گلکۆیەکی بێ کێل
منت باش ئەی مەرگ
کە تا ئێستا وشەیەکم نیە بۆ تۆ

# یاداشتی بەفرو گوێزو سسك



**حەمە سەعید جاف کەلاری**

شنروێ...

رەچەڵەکی دەچێتەوە سەر .... ئاگر

یاداشتی بەفر دەنووسێتەوە

یاداشتی سەفەری بەفر

سەفەری بەر لە غەزا

نامە دەخوێنێتەوە

نامەیەك

لەدوای رژانی تریفە

بەسەر بەرائەتی ئەرزا

بەرەنگی ئاو

لەسەر گەڵای



شەرمی تەڕی

ڕەشە گوێزێکی بێوەژن

نووسراوە

لە شەوێکی ئاتەشیندا

کێ وەکو من

پەی بە سووتانی

کشانی

هەسارە دەبا؟؟.

شنروێ

بیرەوەریەك تاوتوێ دەکا

ڕەوە ئاسکێك

لەو دەڤەرە حەرامەدا

دوێنێ بەوێدا تێپەڕی

بەدەم ڕاوە

لەتەك ئیقاعی ترپەی دڵ

بەدایەلۆگی

مەرگ و مسك

دەس پێدەکا

بە نووکی تیژی شاخی کەڵ

لەسەر پێستی

کارمامزێك نووسراوە

(بەپێی یاسای ژمارە سفری پێدەشت و شاخ

ئێمە هەموو بێگوناهین)

---

* شنروێ: شاخێکی بەرزە دەڕوانێتە سەر شاری هەڵەبجەی شەهید.

# ئاكام



سامان دزەیی

درەنگ بە ئاكام دەگات پەنجەرە
رووت دەبێتەوە رێگا
درەنگ كۆتاییەكان پێدەگرن
بەژنی زراڤی باڵندە
راستەوخۆ دەكەونە ئاوێنە
رووی گرژی هەورێك
هێندی پەمۆ خوێنی هە لمژیووە
بەو شەقامە پێدەكەنێ
چەترێكی زۆری هەڵدابوو
هورەبا دوای چەندین دانووستان
لە دەرگای ئەو هاوێنە سەختەی داین
دەبێ ئەو نهێنییەش وەكو خۆی جێ بهێڵین
چاوی گۆمبەتە خەواڵووەكان
لە تریقانەوەی ئەستێرە چەقین
پەرەكانی چارەنووس دەقیانگرت
چ دەستێكە دەیكاتەوە
ئەی نەزانترین چاوەڕوانی



ئەوە پەیژەیەك بەرەو خۆت
چ خەونێکە
جۆگە لەناو جێگە بەخۆی پێبگەنێ
گوڵەگەنم لە ناو گێڵگە بەخۆی پێکەنێ
کەو لەسەر هێلکەکانی بەخۆی پێبکەنێ
رێبوار لەسەرتای رێگا بەخۆی پێبگەنێ
ئەی گەمژەترین سەردوولکە
نهێنییەکی مێردەزمە
چەقۆی لەسەر ملی درکاندن داناوە
لەپشت دیوارە مەرمەڕییەکانی گڵکۆوە
کەژاوەی پەنجەرەیەکی داخراو
دەکەینەوە
کەژاوەی پەنجەرەیەکیکراوەش
دادەخەین
درەنگ دەریاو با دەگەنە
دەرگا هەمیشە ونەکانی وتووێژ
دەرگا هەمیشە دیارەکانی وتووێژ
دەرگا هەمیشە بێقسەکانی وتووێژ
دەرگا هەمیشە بەقسەکانی وتووێژ
عیشق با دەیبات
تەمەنیش ئاو
برادەری گیانی ئێمەش
لە خۆشییەکانی چاوەڕوانی
گۆرانییەکی نەگوتراوین
لەناخۆشییەکانی چاوەڕوانی
گۆرانییەکی گوتراوین.



**ئەکرەم عەنەبی**

# نزای مردن

سەبا بێدەنگ... ئەم کاسەی سیخچەیە هەڵدە..
کائنات هێور بپژمن..
بێدەنگ: عەدەمستانی زیندانی
منداڵی و مەرگ...
خۆڵی سوری دوای خۆرنشین؛
گشت بێدەنگ بن،
رووباری گریانی خوا، بەنیازە من بەجێ بێڵێ
رووباری گریانی خودا، بەتەمایە
پایزی وشك بوون مارەکا..
مەرگی رووسوور
بەیانیت باش،
برۆ!
دەبرۆ تاتە شۆرەکەت بارکەو
فریشتەکان لە ئامێزی یەکتری بتارێنە..
تاتە شۆرەکەت بارکەو
دنیایە کفن بکرە..
رووباری گریانی خوا، بەتەمایە
زیندانی من بەجێ بێڵێ و



برژێنەوە گەرووی پیرۆز،
بتفێنە نێو پاکیزەیی پەرییەکان و
خوا ببینێ...
بێدەنگ ئەم پەیڤانە بدزن،
خوا لە هەیەجان بێزارەو
بە خامۆشیی بەفریش دڵشاد..
ئەم رووباری گریەی خوایە
بێدەنگ رژایە ناخی من،
نەکرێوە لوراندی بۆی
نە باوکیشم قژی دایکمی بۆ بری..
خامۆش بوو رووباری خوداو
بەدزی گشت کائناتەوە هاتە نێو
عەدەمستانی جەستەی من..
ئەو خۆی،
بەخامۆشی هات
حەللاج قاوی دا،
خواش خۆی لەمەرگ دزییەوە..
ئەزیزم ........ رووباری رۆح،
من قاوی گریانت نادەم
خۆشم خامۆش وەکو تۆ.
کە بێدەنگم
بمرژێنە گەرووی پیرۆز
دەبمکوژە وا بێدەنگم
مەگەربێدەنگ، نەباریتە سارای ناخم!؟
هەر بەخامۆشیش وشك کە..!!
خوای ئازیزم!! وشك بکە..

١٩٩٧/٣/١١ هەڵەبجە

وشك = مردن

# گەڕان بە دوای نیشتمان دا



سالار عوسمان

ئێوارەیەکی سارد
بێ ئاگا لە هەموو شت
بێ ئاگا لە دوێنێ
بێ ئاگا لە وەی کێ یەکەم درزی ئاسمانی نووسیەوە
بێ ئاگا لە وەی یەکەم کات ژمێری شەپۆلەکانی دەریای وەستاند
ویستم (با) ڕاگرم
(با) لە ئاگاییەکدا دەژی
سەری نیشتیمان و
خەمەکانی نغرۆ بوون و
نهێنیەکانی مێژووی پێیە
(با) پێچەوانە هەڵناکا ئەگەر نهێنیەکی ڕاستتر لە پێچەوانەیی پێ نەبێ
لە وەتەی من حەرفەکانی سیاسەت دەخوێنمەوە
(با) هەر پێچەوانە دێت و
سەری نیشتمانیشم هەر ووتر



ئەو ئێوارەیە
ئینۆکەکانم هەڵوەرین
هێندەی بەرەو (با)دا بوەستم
(با) لە ئاگاییدا
تەوژمەکانی خۆی وون کردووە
ئێمەش لە بێ ئاگایی‌دا
پێ دەکەنین
وێنەیەك لە ئینۆکەکان دروست دەکەین
وێنەیەك لە خوێن دروست دەکەین
وێنەیەك لە پەژموردەیی
لە وەڕسی
لە سەفەری بێ هودە دروست دەکەین
ئەلبومێکی تەڵخ
هەموو وێنەکانی هەڵگرتووە
لە نێو وێنەکاندا بۆ وێنەی نیشتمان دەگەڕێین
نیشتمان بۆتە هەڵم و
قودرەتی گرتنمان نەماوە
دەبێ چاوەڕێی هێور بوونەوەی تەوژمەکانی (با
تا نهێنی وون بوونی نیشتمانمان بۆ بگێڕێتەوە
دەبێ چاوەڕێ بکەین
(با) سەری خۆی بدۆزێتەوە
مردووەکان بێنەوە قسە
پارساییەکان بگەڕێنەوە
ئەوسا لە نهێنی وون بوونی نیشتمان تێ دەگەن
ئەوسا لە وێنەکانی خوێن
لە بێ ئاگایی
لە وەڕسی
لە سەرفەری بێ هودە.. تێ دەگەین!



# تەلبەند

**فەیسەڵ دێهاتی**

لە نێو شیشی تەلبەندی ئەم قەفەزە ئاسنینە زەنگێك لە ژێر پلەی سفرەوە
لێدەدەم، زرنگ – زرنگ
تۆ هەر وەك خەوتووی – بخەوە... شیرین خەوە، کەروێشکەخەوە – من
چاوەکانم گەشتر داگەیرسێن..
مەرگی دایکم.. مەرگی خۆم
لەم خاکە سەرشین و سەر بەهەشە بەرزترە
گریان.. گەرمە زیکری هەمیشەیی سەر خۆشیمە
شیلاوی بەردەوامی ژیان
بەپێچەوانەی دەڕژێنم
لە شێکی شپی.. گۆشتن.. توونـد
رووداو.. رووداو
کارەسات.. کارەسا...!...!...!
تۆ هیچ و پووچ و بێ کەلك بی
تۆ قاچاغچیو قورمساغ و نۆکەربی
دەشێ هەر شتێ بیرت بۆ بچێ ئەوبی
ئەوەی ناشێ هەرگیز ناشێ
ناشێ تۆ مرۆڤ بی..!

دەزانم..
ئەم شێر پەنجەیە وەك بەفر دەتوێتەوە
رۆژێك دادێ دەمكوژێ
مێشكم ئاوساوە..
دەروونم گۆڕستانی رووداوەكانی مێژووە.

## مەرگ

ئەم جەستە جوانە دەڵێی دلۆپە ئاوی كانیە سازگارەكانە
ئەم پرچە خاوە دەڵێی پەلكە زێڕینەی دوای بارانی بەهارانە
ئەم چاوە كاڵانە دەڵێی تریفەی مانگی شەرمن و پەنهانە
هەناسەیەك، دووان... ملیۆنەها
وەك گڤە گڤی هورەیەكی سەرشێت لە پڕ دەوەستێ
ئاشوب جێدەهێڵێ
ئەم جەستە جوانە... چەند ساڵێك لەمەوبەر
بەدزی.. بەنهێنی... كەس پێنەزان
لە پەناو پەسیوان، لە ژووری جامخانە بەندە، دەئاڵا
جەستەیەكی دی
تەزووی پێ دەبەخشی و ... چێژی لێوەردەگرت
هەموو خانەیەكی لەشی زمان بوو
دەم ئادەم مژ ڤرۆكە ئاسای منالان دەمژراو
بەردی لووسی سەرچاكان ئاساش دەلێسترایەوە
شەوانی ساردیش تەزیوەكانی گەرم دەكردەوە
ئێستا.. ئەوەتا لێرە.. لێی راكشاوە
چاوەكانی مۆلەق، لەشی ئاوساوە
ئەوانەی بە حەزرەت بوون كەرەتێك بۆنی بكەن
لەبەر بۆنی ئەو رادەكەن، هەفتەیەك دوان
قووتوویەك ئاوی گەنیوی زەردكاوە
وەك بڵێی رۆژێك لە رۆژان هەناسەی ئەشق و حەزی هەڵنەكێشاوە.



# بەشداریکردن لە نووسینی کتێبی سەرەتاییتر لە خەون

بۆ : نەجات حەمید ئەحمەدو سامان دزەیی



سەباح رەنجدەر

دوو کتێب سەر بە ئاسمان وزەوی
لە ژوورێکی لاکەوتە ئێمەیان دۆزییەوە
بە لێوی وشك و قاقای لە خۆرازیبوونەوە درکاندیان
ماوەیەکی بێپەیمانە
ماڵەو ماڵ
کۆڵانەو کۆڵان
گەڕەکەو گەڕەك
شارەو شار
بەرووشکاوییەوە بەدواتان وێڵین
ئاسمانیان لەزەوی هاندا
کورسی لەسەرنشین
باز لە کرانەوەی ئاسمان و باڵ و پارچە گۆشتی
ئاو لەپێی بازەوانی نیەتپاك
لە سێدارەدانی گوڵ بۆ شکۆ شکاندنی بەهار
باز چاوی لە ئاسمان شەپۆل دەدا نیازی هێلانەی دەدرکێنێ
بۆ ئەوەی بێپەروایی‌و دەنگخۆشی لەبەرزاییەکانی سرووش بمێنێتەوە
بە تەنیا مەبەست و مەستی فڕین بەس نییە
گوللەی نەتەقێندراو
نیرەیی بەمەمکی گەرمبوو بە شیر دەبا
کتێب ئەی سروشی ئاژاوە
لە کێڵگەی لۆکە قوڕگی کیژی
چاورەش و
کراس ئاڵو واڵاو
پرچ حەلوایی‌و
کەمەرە شلیان بڕی
بڕوابێنە

وشەکانت لە ناوەندی زەوی نیوە تەواو پەرت و بڵاو کردەوە
بۆ وات کرد
بەختەوەریت لە تەواوی زەوی وەرگرتەوە
ناویش شەهیدی بێنینتیما
ئاسمان بە دەست ئەستێرە ڕژاوەکانی هەراسان
نووسەری ئەزەلی بە ناوبانگە
پێویستی بە ناو نیشان و کات دیاریکردنە بۆ بینین
زەوی‌و ناوو ئاسمانی خستە بەر نیشان و ئەڵقەی کەوان
لەبەرچی نهێنی هەموو چاوەکانت دزی
بە بێچاودێریش ڕێیان نەدای
ئاسیارو کەس و کارت ببینی
چاوێك بە بێچاودێریکردن ڕووگەی لە بینین بچووکبۆتەوە
ئەی بۆ هێزت دایە خەیاڵی متمانە پێنەکراو
نەتهێشت بازی دەنگ گەرم ببێتە بیرەوەرییەکی زیندوو
یان دڵخۆشی مێوانەکانی ئاهەنگ
دزەکانی دەریات دەوڵەمەند کردو بوون بەرابەر
ڕووەکی تەمبەڵی بەر سێبەری درەختی گەورە
کلتووری درەخت بە نەوین نازانێ
زەوی رازاوە بە خانوو پاڵپشتی نەوینە
منداڵەکان کتێب بەسەر چەندین شوێن دا بەشبوونە
تۆماریان بەگەڵێ زمانە
منداڵێك گوڵدانی ژووری باوکی دزی
بردی لە ناو کتێبەکانی کردی بە پاسەوان
یان باوك گوڵدانی ژووری خۆی بۆ برد
کردی بە پاسەوانی کتێبەکانی
نووسەری ئەزەلی قەڵەم پێخوست
فەرمانی لە وشە وەرگرت کەوتە بەر زەبری وێژدان
بەشەرمەوە پۆرترێتی خۆی داپۆشی
پاشای مەرگ ناخەوێ
هەمیشە بێیارمەتی‌و ئاگادار کردنەوە دەرگاکان دەکاتەوە
جوانی لە درەختی بەرداری حەوشە دەکوژێ
زەوی دوای باران دڵخۆشی خۆی دەپارێزێ
بەردەوامیش دووبارەی دەکاتەوە
سامانەو جۆگە خامۆشەکانی ناودارستانی سنەوبەر
پەنجەیان خستۆتە ناو پەنجەی تریفەی ماندوو
کۆرنیشی سەر دارستان چیپەیەکی مەردانەی دا بە گوێیان
ئاگری زیندوو لە چارەنووس هەڵنەهات
ئەزموونی قەڵای مێردانی لە دوو دڵییەك پێشکێش کرد

نووسەری ئەزەلی لە ناو ناوێکی خاوێن ڕاوەستاوە
دەتواندرێ مردووی پێ بشۆی
سەدەف گەرمایی دەداتە پێیەکانی
یاقووت گەرمایی دەداتە پێیەکانی
ئەلماس گەرمایی دەداتە پێیەکانی
مەرجان گەرمایی دەداتە پێیەکانی
برادەری یادو دروود ئەوکەسەنی
لە سەردانی مۆزەخانە پێکەوە بووین
ئەنگوستیلەمان خستە پەنجەی خانمی کەلەپوور
خانمی کەلەپوور داپیرەیەکی بەبەزەییە
دەفتەری تێبینیەکانی وەك پێویست ڕووناك نییە
ئاگری ترس و بەختیارییەکی ژاکاوی لە هەناوی کردۆتەوە
هۆگربوونی دوو گوردی بە ئەمەك و هانازانی
ئەفسوونیش بە تاقانەی ژیان
رکاتی یەکەم
رکاتی دووەم
رکاتی سێیەم
رکاتی چوارەم
سەلامی بەرزبوونەوەی دایەوە
تاجە گوڵینەی تاقانەی لە ئەشق و بێباکی نزیککردەوە
نیشانەی سەر سوورمان کۆتایی هات
نیشانەی پرسیار دەستی پێکرد
چاودێری ئەفسانەیی
چاو پێوەندی نێوان نووسەری ئەزەلی و کاتی باران بارینە
گای ڕۆژانبازی ئارەزووییەتی
بە مووی کلکی تەمی چەوری پەنجەرە سڕێ
پەردە پەنجەرەی خۆشناوێ
پێیخۆشە هەمیشە بە تەنیشتی لارەمك شۆڕ ببێتەوە
پەنجەرە لە ڕەگەزی ئاسنە
ئاسن دەمارەکانی لە خوێن ڕایکردووە
پەیام ڕەگەزی خوێنپاك نووسیوویەتی
پەیامبەر ماڵی گەرم و خۆشی لە ناو دڵی گوڵە
خاڵخاڵۆکە بردیە ناوی
خوێنی دڵی بە جۆشی پەیامبەر ڕژایە لوولەی تفەنگ
خوێنی دڵی بە جۆشی پەیامبەر ڕژایە گوێکەی میکرۆفۆن
نووسەری ئەزەلی مەقەڵەت بێنە پێش
بەرخێك بە تەماشا مەبەست دەبێ و ئاهەنگ دەگێڕێ
ئاسمانی بە ئەستێرە منی بردە کۆڕی یاران و ئاسینی هەموو شتەکانی

دڵشادیی و کەشی جوانی
خورەی ئاوی زوڵاڵیش خەیاڵی خۆشکردم
دیکتاتۆر ناهێڵێ بۆنی خۆشی بەرێی خۆیدا بڕوا
پێش ئەوەی لە ماڵ دەرچم ڕووتم پیشاندە نەی سرووش
گوڵ ئاو دەخۆنەوە گەشانەوەیان دەکەنە
ئەو پیاوەی بە خۆشییەکی خانەدانانە و منداڵانە ڕایگەیاند
نامەوێ ئامرۆڤ بە کۆیلەیی ببینم
دیکتاتور بۆ خۆشادمانکردن دەیننێرێتە ناو ژیانی
لێوان لێو لە تیرو توانج و تەقڵە پێلێدان
منیش شووشەی مەرەکەب یان تۆپی یاری
دەگرمە دارەمێوی لك بەهێشوو داچۆڕاو
بازەکانی دەفرێنم یان بەفری دەتەکێنم
گشت ئاوەکان یەك ئاون
گشت بایەکان یەك بان
گشت ئاگرەکان یەك ئاگرن
گشت خۆڵەکان یەك خۆڵن
هەور بیر دەکاتەوەو دەڕوا
یان بەدوای دەنگی کێڵگەیەکەوە دەچێ
باران بێباکانە بەناو بیر کردنەوەی تێدەپەڕێ
نووسەری ئەزەلی لە دوا ڕکاتی نوێژی یەکێتی ئەشق
ئەم حیکمەتەی بەرز کردەوە
گەر دەروونی خۆت پڕووناکی نەبوو
تەماشای هەتاو مەکە بیر کردنەوەت لێ ون دەبێ
گریانی بێبیانووی مێوانی داناو ناودار
سمۆرەی سەر کاکڵە گوێز لە ئەمەك و خۆشی توایەوە
لوول دەخوا و خەریکە دەنووسێ
گومەزی لووت بەرز کوا کۆتایی ماڵی خانەدانانە
تاسەی لووتکە
ڕازی لووتکە
وێڵی لووتکە
مەستی لووتکە
لووتکە نەی پەنجەرەی داخراو و کتێبی بەندایەتی
ئاژانسەکان هەواڵی بەرز بوونەوەی دیکتاتۆریان تێدا نەبوو
خانە گومان وشەرمەزار بیری لەبەد ئەشقی کردەوەو چی پێکرد
بە بینینی
شەوی بە ئەستێرە
بەهاری بەهێز
تیشکی بە پیت



لانكي به مندالان
خاموش و دەم بە باوێشك دەروون گرژ بوو
لە بورکانێکی دەکرد گەرمایی پێنە مابێ
بازگە دەرگای گەورەی شارە
بە چاوی نیشانگرو هەستی فریودەریەوە دەترنێتەوە
شەقامی گەورەی خۆشبەختی‌یان بەدبەختی
ژیان لە مردن کۆنترە
مردن شەمەندەفەرێکە بەیەك ئاراستە دەڕوا
شەمەندەفەر هەمیشە لە کاتی خۆی رانابووری
ژیان یانی سەوزایی خومارو خۆبوونی کاتی رابووردن
دەچمە کتێبخانە رۆژنامەی سبەینان وەردەگرم
بیر لە ئاژانس دەکەمەوە
بۆ پاشا جەنگی مانەوەی نەکرد
لەسەر هێڵی ناوەڕاستی زەوی سوپاس بۆ بینین
بۆنی خۆشی جوانیی بە شوێن پێی خۆیم دەبا
یان تاسەی دەمهاوێتە سەر ڕێگایەك کەدابەشاکرێ
چەتری خۆشنوودی دەکەمەوە
سێبەری وڵات بزر کردوو ئومێدی تێدا دەدرەوشێنێتەوە
وڵات بزر کردوو بەهای سێبەر دەزانێ بۆیە لە وچان شەوقێکی تەواوە
خوێنی ناو چێشت مەتەڵی ژیانی هەڵێنا
ناو دووجار بەرووبارێکدا ناڕوا
بەڵام هەمیشە لە ڕۆیشتندا دەروون گەرمەو بێدایك نییە
خەونی لاواز پەلەیەتی خەونبین خەبەریببێتەوە
درەختی لاواز پەلەیەتی تیشکی هێزدار داگیربکات
سەر کردەی لاواز پەلەیەتی لەشکر میلی تفەنگ نەهێنێتەوە
کتێبی لاواز پەلەیەتی خوێندەوار چاوی ڕەشکەو پێشکە بکات
خۆم کەشی سەربەستی خۆم دەکەمە
ڕەنگی بەیان و شینایی ئاسمان
ڕەنگی بەیان منداڵێکە خاچێکی بەدەستەوەیە
شینایی ئاسمان پێغەمبەرە دەگا بە چارەنووس
نووسەری ئەزەلکەی هێمنی و میهرەبانی دەکەیتە ڕستەیەکی نووسراو
لەم شارەدا دوا پیاسەمە چاوم لەناو
مۆسیقای دامەزراندنی و
گۆپاڵی دڵخۆش پیرانی‌و
حەوزی شڵەقاو بەمراویی‌و
خەتە خۆشەکانی ناوچەوانی دیوارەکانی‌و
شێتە بەرد هاوێژکانی گەڕەکی‌و
پەنجەرەی ئامێز بە منداڵیماڵەکان دەکەمە پاسەوان

پەنجەرە چەندین پیاوی دژە مۆسیقای
لە خۆیدا مردادندووە
بازی خرۆشا و ژیانی بە ئاسمان داوە
بابەفری پەرەکرد
ئەسپ فەرمانت بە چییە
سەرپێچیو پێداگرتن
بەهێز بڕوانە
ئاسمان تەنیایە پێویستی بە دڵتە بینێریتە ناوی
گەلە گورگیهار ئەویاتی زەوییان تەواو پشکنی
لە بیری ئەوەدان بڵندایییەکانی لێکبدەنەوە
باران بە دەستی نەرمی
ئەویاتیو بڵندایی لەخەو بە ئاگا هێنا
هێنایە ناو ڕاستایی تیرەکانی پێ چەماندنەوە
نووسەری ئەزەل بە جوانییەکی ڕوون دروست بووە
لە بەخشینی خوێنی گیانی یان سۆمای چاوی
بۆ یەکێتی ئەشق ماندوو نابێ
تەلی تەلەفۆن بەناو پەنجەرە هاتووتە ژووری
دەم بە باوێشکی بێجووڵەو بێبەرەکەت
ڕەنگی سووری تاریك تێیدا درێژەی کێشا
پاشا کاتژمێری دا کەندراوی
دەست باوکی مردووی لە دەست کرد
بە سواری ئەسپ هات
ئێمەی هێنایە سەر سەکۆکانی شار گوتاریدا
کەس دڵی نەداییێ
دڵ ناپرسێ کێی
ڕوو وەرناگێڕێ مێوانپەروەرە
دەستی بەرەو حەوانەوە دەگرێ
کەس هەستی نەداییێ
هەست ناپرسێ کێی
حەپەساوی کش وماتی
دوای تەقەی شەڕێکی بێنامانە
کەس گوێی نەداییێ
گوێ ناپرسێ کێی
دەنگدانەوەی پرسیاری سەغڵەتکەر
پەردەکانی دا ڕزاندووە
کەس چاوی نەداییێ
چاو ناپرسێ کێی
لە سەرنجدان وەك بەهەرەمەندی ڕۆمانسی

بە هەڵپە خۆی بۆ بزەی ئاسیاری هەڵداوتێ
دایکی هەر هەموومان هات ڕستەیەکی ئاسوودە کرد
سێبووری نەیهێناوین
ڕەنگی ژیان لە ئێوارەوە گۆڕێ
بۆ کوێ دەڕوێن
بۆچی دەڕوێن
زەمین بریتییە لە ڕوخساری ماندووی
کەسنە ناسێکی ناو تەپ و تۆزی پەرش و بڵاوی
برادەری لەگەڵدا نییە
بە بێکەسی سنووردراوە
* * *

نووسەری ئەزەلی
گلۆپی مەوداکانی گفتوگۆی زەرد کردووە
حاڵیشە لە میهرەبانی ڕووناکی
ڕووناکی یانەی تایبەتییە
دەشزانێ گەشانەوەی خونچە دڵخۆشی خوایە
دڵخۆشی خوا مۆسیقای ڕاپەرینی تەواوی زەوییە
مۆسیقا دەنگی ژیان بە گوێی
ئاسمان
برادەرایەتی
ئادەم
دەگەیەنێ
پێویستە ئێمە ئایەک بڵێین
* * *

نووسەری ئەزەلی
گلۆپی مەوداکانی گفتوگۆی ڕەش کردووە
حاڵیشە لە جادووی تاریکی
تاریکییانەی تایبەتییە
دەشزانێ سێبوونی خونچە دڵتەنگی خوایە
دڵتەنگی خوا زەنگی کەوتنی تەواوی زەوییە
زەنگ دەنگی مەرگ بە گوێی
ئا...مان
برادەرایەتی
ئادەم دەگەیەنێ
پێویستە ئێمە ئایەک بڵێین

* بەشی یەکەمی ئەم چامەیە لە ژمارە ((٤٩))ی گۆڤاری (ڕامان) بڵاو کراوەتەوە و بەشێکی تریشی ماوە



# سەمای دەنگ‌و

# مەرگی هێڵە راکشاوەکان

ئەسکەندەر جەلال

ئێرەیەکی‌تر دێنم پڕ بێ لە ئارامگاکانی دوێنێم
تاشەو شەو هێمنی بچنم..
زەمەنێکی‌تر
لە کازیوەیێ دەسەنم‌و شەبەق ئەو برینانەی لێ ئاوەڵلا دەکەم
کە مرواری تیایاندا سەرە تاتکێ لەگەڵ ڕۆژ دەکا..
بەفری گۆلمێ موو کەوتە سەر ساباتی کەللەم
بێوازی تا نزیك خۆ کوشتن خۆی دەقەبەڵ کردم..
نا ئومێدانە تەرمی ئەو ئومێدانەم بە ئەسرینان شووشت‌و
ڕێز ڕێز ئەو چاڵانەی تەشانۆمم لێ تەژی کردن
کە بە زۆر لەسەرم کرابوون بە ماڵ..
چەند خولەکێکی‌تریش لەبەر ئەو سێبەرانەی برێکیان لە خۆڵە ڕوودەنیشین
ئەو کەڤرانە هەڵگێڕو وەگێڕ دەکەین کە کەس مێژووی دروست بونیان نازانێ
هەندێکیان لێ لە بریناتمان دەکەین
برینەکانمان بە خۆڵ نەبێ سارێژ نابن نا...

حەكیمانە لەو تیشكانە وورد دەبینەوە كەلە دووری‌یەكی مەزندە نەكراوەوە بۆمان دێن
وورد وورد دەبینەوەو سەرنجی لە غارغارێنی مێروستانە عەسكەرییەكان دەدەین
ناگەینە كوچەیەك لە خەیاڵ تەرمی عیشقێك لە ئەزمێكی نوێی لێ نەنێژرابێ
كوتە كوتی دڵانیش هەر لە زیاد بوون...
ئێرانە مەملەكەتی گریان‌و هەرەسە
ئاوهێنانە بە بێژینگ..
سەرخستنی زەوی‌یە بەسەر بۆشاییەكانی ئاسمانان..
ڕەتكردنەوەی هاتنی خۆرە دوای شەوێكی تاریك تاریك
بێ هوودە بوو.. عیشق لەگەڵ سۆزانیە تازە پەشیوانەكان
بێ‌هوودە بوو .. فرمێسك ڕشتن بەسەر تەرمی ئومێدە نائومێدو جوانە مەرگەكان
خۆمان لەو شەڕانە پێ بێ‌بەری نەكرا
كە باوكمان بە ئاگاییەوە دەیانكرد...
نەكاراین ئەو قێلعە نارێك‌و بەدانە ڕەتكەینەوە
كە لە سۆنگەیەوە نەخشە تۆكمەكانی فراوانتر بوونی بارنەكانی زەمەن هەڵوەشایەوە
هەرەتە كردنی بوولبول بوو مەرام..
بۆن كردنی ئەو گوڵەخە جولانەی ئاونگ لە ڕوویان دەچۆڕا
هەرەتە كردنی بوولبول بوو مەرام..
چەرێنانە درۆ درۆ شەڕمان كردو مەینوك مەینوكیش دزی...
ئەوە ژیان بوو، لەگەڵم كەوتە دژوارترین حەرب
بێ دڵ پێ سوتان‌و بێ بەزەیی پیا هاتن سەركەوتنی خۆی بەسەردا بڕیم
من‌و منەكانی لێك ترازاند
كردنی بە سەدان پارچەو لەتی ژاكاو ژاكاو
هەر یەكەشی فرێدانە چاڵێك لە چاڵەكانی غەریبی..
كێ دەزانێ ئەم هەموو لەتە بێنازانەی ڕۆحم بەسەر كامە كەونی غەریب
بەستەزمانانە پنتك پنتك بوون...
غوربەتی خەریكە هەناسەمانە دەبڕێ...
باڵای لە باڵامان ڕەتدەكات..

ئەوە تا زام زام غوربەتمان لێدە چۆڕێ..
غوربەت عیشقتان بۆ جێدێڵین..
عیشق عیشق گریانمان لە خەندە تاشیوە..
خەندە خەندە باریتی فرمێسکەکانتان بۆ ئاشکرا دەکەین..
گوڵ گوڵ یەکتر ماچ باران دەکەین..
نتم نتم خەفەتمان لە هەنیە دەچۆڕێ..
زوێڵ زوێڵ رۆحمان پەرت دەبێ..
تەمننا دەکەین تەمەننا..
بەم تاریکە شەوە غەریبانە مەرگ بارانمان کەن
کە پروشکە باران تیایاندا زەوی تەڕ ناکا..
دڵرفێن بوو ئارەقەی گەڵو هیلاك بوونی پەپوولە
بە پێ بڕینی زیاتر لە مەسافەکانی شەممە بۆ کۆتر چەند ئەرکێکی قورسە
پڕ لەززەتترە ڕوانین لە لەنجەو ڕەوتەنی کۆتر..
گوێم لە دەنگی مەرگەو بۆنی تەڕێتی خاك دەکەمو خشەخشی مارومێرو دەژنەوم
بازنە بازنە خەندەی پچراو لە لێوەکانم دەکەمەوە..
قەت قەتیش خۆم بۆ مەراسیمی بەڕێکردنی رۆح ئامادە نەکردبوو
ئا، ئاشناترەکەم.. نەبەد ڕۆژی لە بەرامبەر مەرگ نەموورتووە نەفسوس!
بە نێو وەرینی گەڵای دار هەنارەکاندا دوعاکانمان ڕەوانە دەکەین ئەو ژانانە
دەمانکوژن کە جوێ بوونەوەکان برین برین دەیانخە گیانمان
رۆح رۆح لە قەپێلکی جەستەمت بۆ هەڵدەڕێژم..
موولەلەکانم خوێنی غوربەتی بە دیوارەکانیان مەییوە..
دیدەکانمان نازانن بینین چۆنە..
لە فەزای ڕەنگاڵەیی باگراوندی لەوحەیەکی قەشەنگ قەشەنگ
نیشتەجێ دەبم..
لە ئاپۆرەی سەماکانی رەنگدا من وون دەکرێم..
لە مردنە لەسەر خۆکانی هێڵە راکشاوەکانی ناو ناریکیش
تەرمم نادۆزرێتەوە نا...

# لێوارەکانی وەڕەس بوون

ئێواران
شۆستەکانی ئەم شەقامە بێ ڕیتم دەهاتنە سەما
کات بەبۆنی پرچی سنۆبەرەکان مەست دەبوو
بەپەڕەی گوڵ
سیمای ئاواتی ئاڵ دەکرد
پەنجەکانم
تەوقەی پەرچەمی شەوێك بوون
مانگ بەخودکارێکی سور
چارەنووسی دەنەخشاندن
تۆ دووی سێبەری هەتاوێك کەوتبووی
ئاوڕی لێ دەدایەوەو
ناوچەوانی گرژ دەکرد
ئەوەندە
لە دەستی ژان دەترسای
بەرۆژ دەهاتە خەونت و
شەوان فتوای حەڵاڵ بوونی مەرگی دەدای
بەیانیەك
کوچەکانی ئەم شەقامە
پڕبوون لە بونەوەری جۆراوجۆر
هێڵەکانی دەکشاو دەکشا
شەمەندەفەرێکی چارەنووسی
گوڵە سوورە زەرد هەڵگەڕاوەکانی دەشێلا
کەترس ڕەنگی بردبوون



چنار نامیق

شەو لە تاریکیدا گریاو
مانگ لە تارا سپییەکەی سەری وەڕس بوو
ڕۆژبەتیشکی گەرمی
جەستەی سپی خۆی دەسووتاندو
بەرەو ژوی ئەو سوتانە
سیمای ئاسمانی ڕەش دەکرد
چەمە لە بێئۆقرەیی ئاو ڕابووەوە
کانیلەیەك لە تیوندا گەروی وشك بوو...
لە ئەلبومی یادگاریەکانم ڕادەمام
وێنەی خۆم و هاوڕێکانم نەدەناسیەوە
تۆ سەر بە هەرێمێك بویت
ناویت نەدەزانی
وانەکانی قوتابخانەت بیر چووبۆوە
پیتێکی بارانت بۆ حونجە نەدەکرا!..
کات لە سورانەوەی خۆیداو
کاتژمێر لە سورانەوە
وەرس دەبوون
گەڵای درەختەکان بەچاوتروکاندنی ڕەشەبایەك
بەگژی یەکتردا دەچوون..
بایەقوشێك
وێرانکەانی خوێندنی خۆیی دەژمارد
کۆترێك بێچوەکانی لە ئامێز دەگرت
من تۆو زەمەن و عیشق و شەقامەکان
لەگەڵ بیرەوەرییەکانماندا ناتەبا بووین
زستانان بەرگی هاوینەمان دەپۆشی‌و
هاوین لەرز دایدەگرتین
بەهار چاوەکانمان دەنووست
تەنها خەزانمان خۆشدەویست
ولێ ئەویش
نیگاکانمانی هەڵوەراند
کوێ بۆ نیگا ڕژاوەکانم بگەڕێم؟





# ئێوارە بوو هەنگاوەکانی خنکاند

بیکەس حەمەد قادر

لە کەنارەکانی دەریا تەنیاو تەنیا
بەتەنیایی لەم دەڤەرەی نێویان
نابوو دەڤەری شەڕ
بە تەنیا دەڤەری کێبڕکێ و یەکتر لە ئەرزدان
ماتەمم دەگێڕا
تۆش بە پەنجە گۆشتنەکانت
بیرەوەرییەکانت رەشدەکردنەوە
دەمنۆڕییە هەورەکان و
سەفەریش لوولی دەدام
بۆکوێ خۆشم نازانم نا
خەیاڵ بزرم دەکات
روودەچمە نێو قووڵایی نهێنییەکان.
بەتێڕوانینی گەرمی چاوانت
هەورەکان تا دەهاتن گەرم گەرم
دەبوون
رێژنە بارانیان دادەباراندو

سەرلەنوو زەوییان دادەشۆرا
بەفریش لەم سەر
هێدی هێدی غلۆر دەبوونەوە
گوێ دەگرم لە سەمفۆنیای بەیانیانی
کوکوختیان
بەزەییم بە خۆم و بەتۆو بەهەمووان
بەشەقەی باڵی کۆترە نەسروەتەکان
دادێتەوە
دەنۆڕمە سووری خۆرئاوابوون
لەنێو ژاوەژاوەی کێبڕکێدا
بێدەنگی لو ولمدەدەا
ڕوو لە ئاسمان دەکەینەوە
ئاسمان وێنەمان تەڵخ و
بارانیش بێ بەزەیی تولەڕێیان دەگۆڕێ
لەم مەملەکەتە شەقار شەقار بووەدا
بەرگەی دامان و خۆخواردنەوە ناگرین
چرکەساتە بێ ئابرووەکانی بەری دیتنی مانگ و
دەستە چرچ و لۆچەکانی هاوڕێم
لە ڕیشە گرژو قژە تێکئالاوەکانی دوێنێ دادێنم
ئێوەو کۆچم پێکڤە خۆشدەوێن
ئێوە بەرانەتتان لێدەتکا
بەری ببنە یادگاری تەنیایی شەوانم
کانیاوەکانیش دەتەقینەوە
ڕێگاکانیان دەگۆڕێ
تەمومژیش نەستێرەکانیان دەشاردەوەو
ئاخی کێڵگە تێنووەکانی تەڕدەکردو



لە دامێنی زەوییان دانا
ئاسمانی پڕ لەنهێنی سنووری بیرەوەرییەکانی تێکدام
ئاخ سەفەری مێژوو ئەوە چ نامۆبوونێکە
بەخۆ.. بەئاخ... بە ئەز... هەر بەخۆ
شەکەتیم بەسەفەرەکانیش نەحەسایەوە
رووبارەکان لەم دووریانە ترازان
مەرگی گەڵاکان و تێنویەتی زەوی
وەك خۆیان مانەوە
بە دوای شوێنە نادیارەکان دەگەڕێم
بەدەم رێگاوە چیلکەدانران لە تۆزی
کەلەکەبووی مێژوو وەردەدەم
لەخۆم دەگەڕێم، لەم خۆیەی کە هەموومانین
لە شەوی تەمومژو تەنیایی
ئێوارە بوو هەنگاوەکانی سڕکردم
سپێدە بوو گوڵەکانی سڕکردم
گرمۆڵەبووم یادگارییەکان وەك خۆیان هاتنەوە یاد
نێو قەرسیلان بووە هەوەڵین گەوزاندنی کیژانی فێرکردم
گەوزاندنیشم نەدەزانی تەزوو بەلەشم دادەهات
بوورانەوەو خەوزڕاندنیش لە سپێدەبوو
خەونەکانم شێلدرانە ژێر پێ و
رووبارەکان هەر برسی مانەوە
منیش هەر شەکەت، هێدی هێدی
لەبەر خۆمەوە دەمگماندو
ئۆف لەم بێ هودەییە
وێنەی خۆم لە کەنارەکان
رەشدەکردەوە.

# سرودێ بۆ خاکەلێوە

فاتمە حوسێن پەناهی
سنە

ئەو دەرووەش(١) بەسەر ژوورێدا
دەڕووخێ!
نا ئومێدی گەردنی بێ گەردت دەڕەنگێنێ،
دڵەڕەبایەکی بێ قوفڵێت!
ئاوەشتەی خوڵەمێشێکی نادیار دەبێ،
خاکەلێوەی گەورە گڕ دەگرێ،
گەشت دەکاتەوە
ئەو سۆزە بێ وەختانە،
لاوژەی عومرێکی گەرم بوون و ،
چاوانت پڕ دەکەن.
*   *   *
بەشانی چەپکێ زەردەگەڵادا،

هەڵدەنیشی
لە بن کوورەی هەوریشەوە،
ڕێگا بەبایەکی سوتێنەر نەدرا،
نەدرا کە بێت و تۆفانی –
دەوری ئەو بووکە تێك بدات!
پوولەکەی کراسی عەشق،
بەسەر تەنوورا دادەوەرێ
تامی سووتان دەکەیتەوە!

*　　*　　*

لە ئارامگەڕەشەکەی ڕەشەمەدا –
– ڕاکشاوی!
ئاوێنەش ئاوەزا بووەو،
کوێستان و گەرمیانێکی ڕووت،
سپی کەسك، سوور،
شەوەکان سەریان کردۆتە سەر لاقت!

*　　*　　*

مانگەشەویش بە هاژەی زەمانەوە
بە دەردت نازانێ
خۆت لە ئاوو ئاگران داوەو،
ئەستێران نوقمی زق(٢) دەبن.
گەنمەکانی سەر دیوارێ
گەدایی خەرمانان دەکەن

*　　*　　*

با لەبرینەکانت دەدا
ئەو خەونە دەتباتەوە ژێر
کەپری حەزەکانت



دەست بلاوبووی
وەك لێوە داخەكانی خوەر(٣)
كە بە درەختێ دەیبەخشێ و
لە ژێر تارای كاڵ و والیدا
لیمۆیەك پێ دەگا!!

* * *

شەماڵ،
بەپەنجە شمشاڵییەكانی
لە باهێزی (٤)، باراناوی
سەوزەشانەو شان دەكا!
شەرم:
وەك ئارەقی هەزار ساڵانە
مەمكەكانی داشاردووی
موومیاكراوێكی مەستی!
بە پەلەبووی
بەلاولاواندا هەڵگەڕای!
دوگمەی كراسەكەت دادەكەوێ
وەی لە تۆكەماق ماوی!
بلووریێ بووی‌و،
بەسەر ئەو تەنگەبەرییە كەسكەدا
- كەوتی
تەمەكانیش تاوانێكی بەلێزمەن
دەخوشێنە ناو بەرۆكتەوە!
لێوە ماندووەكانت
خەم دایگرتوون
مەرگیش وەك خۆی،

دەچێتە دڵتەوە!

قفڵە ڕەنگینەکانی ژیان بەرت نادەن.

ڕۆشنایی دەلاقە

بەقەفێك لەقژتەوە یەخسیرە!

لەدوکەڵستانی ئاواییدا،

ڕیسوا کرای.

هەتا قەرەی قیامەتێ

دنیا بە لۆقەتت (٥) دەزانێ

ڕەها کرای

ڕەهاکراوی سەر ساتە ساردەکانی!!

وێنەیەکی مۆر

یادگاری مەرگەکەی مەرگانت!

دوسێ دڵۆپەی پڕاو،

پڕاو بەسەر نافەکی گەش و شیندا

ئاخ گەر نەتوانم،

بەرگری لەقاچ و قولی وڵاتم بکەم!!

* * *

خوێن ڕژانە،

ڕژانی خوێنی نێو چەوانت

خەڵتانی خەم

دڵت خۆقەلاکانی بانییە

هەردەم بکاری بیروخێنی!

* * *

خەونێك دەخزێتە سەر ڕانەکانت

هەتا چارەکێکی تر

پێش کرانەوەی چرا



نوورێکی یاقوتین دەبێتە یارت
چوارچمکی مانگی شەرم دەدەیتە یەك
بە ژەهراوی فەرامۆشی دەسپێری
وەك پارچە کاغەزێکی کێوی
بێ قەراری!
بێ قەرار!!

*　　*　　*

پەنجەرەت رووی لە بایە
خاکەلێوەش
خەندەیەکی عاشقانە
باران بارانە
دنیا لە لەنجەو سەمادایە
لە چاوو دەمدا هەڵیدەگری
دەریا دەریا رادەموسی
دەخزێتە باوەشی ئازادی ئاوەوە
ئای
ئاوی ئازاد!!

---

١- دەروو: ئەوەدرزەی روناکی پێدا دێتە ماڵەوە
٢- زق: چەن (لماو)
٣- خوەر: هەتاو
٤- باهێر: بیابان
٥- بلۆقەت: تەمەنی بالغ بوون

بەشێک لە چامەی

# ئەهلی کەهف

زەلکاو

زەلکاو

زەلکاو

سەراپا دنیا بە زەلکاو گیراوە

دەرودەشت

کێو

بیابان

جەنگەڵ

دەریا

زەوی

ئاسمان

دەشتەکیەکان

کێویەکان

بیابانیەکان

جەنگەڵیەکان

دەریاییەکان

زەوینیەکان

ئاسمانیەکان

هەست

نەست



فەرەیدون سامان



مێشك
ڕۆح
ئالودەی زەلکاون،
گیراوە بە زەلکاو دنیا سەراپا،
زەلکاو
زەلکاو
زەلکاو
ئەمە تۆفانی نوحە
یان زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆن
کێویەکان لە کێوان نامۆن
بیابانیەکان بێزارن لە بیابان
جەنگەڵیەکان لە چڕە سێبەری درەخت
دەریاییەکان لەسەمای شێتانەی شەپۆل
سەر زەوینیەکان لە هەناسەی دوکەڵاوی زەوی
مەگەرنا
لەم زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆنە
خەراباتێك نابێ
ساقیەك نایێ
پیاڵەیەك مەی بهێنێ
تا لەسێو گۆمی مەندی بەدمەستیدا غەرق بین
دەنا لەسەر تەرمی ژەهراوی
ئەو هەڵدێرانە
ئەو بیابانە وشکەڵانە
ئەو جەنگەڵە تاریکستانە
ئەو دەریا سەرشێتانە
ئەو سەرزەوییە ئالودەیە

خەون بە قوڵایی
بە چڕی
بەجیوەیی
بە ئۆلۆمپیادی مێش و مەگەزەوە ببینین.
هیستریای ئاسمانیەکانە لە ئاسمان
مێشك لە کەللەسەر
هەست لەنەست
رۆح لە جەستە،
ئەمە تۆفانی نوحە
یان زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆن
مەل چریکەی بەدرەخت ناگەیەنێ
باران لە پێدەشت
بەفر لەباڵای کێو
لم جەستەی بیابان
منیش چاوم لە بینایی
دەستم گۆج
قاچم شەل
جەستەم هەڵپروکاو
لەنێو ئاتەشکەدەی گوناهو پەژیوانی
سێبەرم، سیخورە بەسەر باڵام
دەنگ لەز مانم
رەنگم، لە پێستم
دڵم، ئەشکەوتی هەزاران رازو
قورگم هاواری خوێناوی عیشقێکی ناکامە.
شار،
شاشار

گۆڕستانە
گۆڕستانی زێندوانیٚ
کە لە ژێر چەکمەو قۆشەنی مارو مێروو
مەغۆلی بیٚ ئامانی مێش و مەگەز
تاج و تەختی بتەکان دەپارێزیٚ
هیستریای خواوەندەکان
بۆ نەسلە لە دایك نەبووەکان دەگێڕنەوە
م ن ی ش
لەنێو ئەم زەلکاوە بیٚ ئامانە
لانکی شەو
بێداری منداڵیم رادەژەنیٚ
خەونەکانم
لەسەر پێلوی هەزاران هەزار شەوی دیکە رادەبرن
دوا بلقی ئەم زەلکاوە
دەست لەخنۆکەم دەگریٚ
چاوێك تێم دەڕوانیٚ
گۆرانیەك دەمستریٚ
دەستێك بانگم دەکا،
تا جریوە جریوی چۆلەکەی مەرگ
سەما بە جۆلانەکانی بەرەبەیان دەکەن،
جگەرەیەك دەمکێشیٚ
هەناسەیەك هەڵمدەژمیٚ
لێوێك رامدەمووسیٚ
باوەشێك خەون گەرمم دەکەنەوە،
ئەی رۆحی نەفرینە
کە بەدوو جاویدانی وێڵ بووی
لەو گەشتە بێهوەدیەی نەڤین
کە بە والآبوونی دەروازەکانی مەحاڵیش دوایی نەهات
بارانێك نەباری



ئەو رۆحی ئەفرینە سپی بکاتەوە
گڕی سوتێنەری دووری نێوان
چڵێك لە درەختی نێو جەنگەڵی بەردینی عیشق
بکاتە مشتیٚ خۆڵەمێش
تا بەبارتەقای دووری بیٚ سنووری
نێوان ئاسمان و ڕێسمان
لەنێوان مەزاری بت و بتەواندا
تەمی هەڵچووی پەژیوانی خۆی بنوێنیٚ،
بۆ تۆزقاڵیٚ سێبەر
لەنێو لەپی میهرینیدا
هێلانەیەك بۆ بێچووەکان
گەڵا وەریوەکان بکاتەوە
یان لە گۆشەی خانەقایەکدا
دەفی مردن بژەنیٚ
برینی جەستەی بزمار ڕێژکراوی سارێژ بکا،
لە ژێر سێبەری گەڵاکانی ئاسوودەیی
دوای زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆن
رۆحی ماسیەك،
ئەسپێك
هەڵۆیەك
یان درەختێکی بێتە بەر،
منداڵی
خەون بە منداڵیی خۆی ببینیٚ
زەلکاو
زەلکاو
زەلکاو
سەراپا بە زەلکاو گیراوە دنیا

هەولێر تەمموزی ٢٠٠٠

# باوەشی گەرمی ناو

شێرکۆ مەحمود

تەماشا لالە کپ و نامۆکانی بەفر لەسەرزەوی و
سەمفۆنیا تەڕو پرچە شەکەتەکانی – با – و
شەونوێژی دەوەنە سامناك و چڕو پڕەکانی بێدەنگی
دراوێکن لەو پیاسە گرینۆکانەی پڕ لە هەنگاوی منالی
کە شەپیورەکانی هانا لەسەر قەبرە زیندووە سروشبەخشەکان فوو دەدەن
وەرن...
جوانەمەرگی ئەو تابلۆ بە هەڵەداوانەی بولێلْ و
ئەو سەمەندەرانەی هێشتا پەردەی یەکەمیان لە شانۆکە نەبینیبوو کڕوازن و
ئەو پەرەموچانەی کرابوونە باوەشێن بەدەستی ژنە خەپەکانی نێو کەشتیە
ماجەلانیەکان و
چرۆ فرمێسکەکانی حەجامەتی پاڕانەوە
تێکەڵ بە کەفچڕە رووح سپییە ماچاوییەکانی دەریاکەین
سەیرە
چەترەکان بە رەهێڵە باریبوونەتە نێو لەپتان و
بارانیش غەریبی ئێرەی دەکرد

دژونن ئێوە دژون
ئیرەییم بە کەسێ دەستی بە خوێنی لە داردانی ئاوێنەیەك نەوە
بە کەسێ لەسەر بەرۆکی شەوەکانا
خوێنی کچێنی پەنجەرەکانی نەرشتووە
بە نەفرەت بن
لە کەشتی دابەزین و قیبلەنامەکەیان لێدزین
خەو بردمیەوە کە هەستام
تێشووەکەم بەشانی فیردەوسییەوە بوو
نەژادی غەمەکانم فرمێسکیان دەباراندە سەر
دراە کۆکراوەکەو
هەفتەیەکیش بەدیار (یا نار کونی برداً وسلاماً)
هەڵکورمام
لەوێ زانیم گەر سوراحیەکان پڕ دەبن لە ئالو
بای هەوەس رادەماڵرێ
زووکەن
تەماشا لاڵە کێ و نامۆکانی بەفر لەسەر زەوی و
سەمفۆنیا تە ڕو پرچە شەکەتەکانی - با - و
شەونوێژی دەوەنە سامناك و چڕو پڕەکانی بێدەنگی
بخۆن بخۆنەوە لەبەر کەن
ڕەنگە مانگ شەوێ چارۆکەی رابخاو
فریشتەی تریفەکانی غوسلتان پێبکات
ئەی ئەوە نییە
ئەستێرەکان بەسەر شوێنی تەمەنتان دادەڕژێن و
تەماشا دزەکانتان لەنێو حەشامەت
مناڵە سواڵکەرێکن و قەپی تامەزرۆیی لە هەموان دەگرن
ئەفسوس کە تارماین و لەگەڵ تەمتومان میعراج دەبەستن
ئەو گوڵانە ئاو مەدەن نایلۆن گەورە نابێ



سەنعانیو زنناری سەفا نایانکاتە نیلۆڤەر
هەر هەورەو قاپوتی تەڕە لە وشکی دەمانپارێزێ
دەمانکاتە سەرگوزشتەو بۆ جەنگەڵ دەمانگێڕێتەوە
لە مەجلیسی درەختەکانا ساقی دەبین
لە یەنسی نزاکانمان پولەکەکانی کۆڵوانەی ئاسمان هە ڵوەرین
لە حەیبەتا چوونە کڕنۆش و
تەبای نەمامەکان
لەسێبەر رادەمان
لەو دیوی درزی نیگای مەرجانی
بەسەرتەلاری لاڵ بوون دادەڕژان
لە ئەوجی رووسووری پەپوولە
بەرائەتی ئاگر
بەسەر تەرمی خۆڵەمێش دوا خەندەی دەکوژێتەوە
زەمین بەمن ئاوس بوو و
بە چڵە زەیتونەکانەوە زا
تابلۆیەکم لەبەفرو لە باوەشی گەرمی ئاو
سەرخەوێك دەشکێنم
چاوە بەندۆلییەکان گاردی رووحمن
نەبادا پۆشاکی لەبەر داکەنێ
بەفر لەناو گەرمی قاچە پەمۆییەکانی هەڵدەکێشێتەوە
ئێمەش قاچەکانمان زیاتر بینی زەمین تەنگ دەکەن
من ئەو موژدەیەم کە مامانەکەم دای بە دایکم
کوڕێکت بوو
دایکیشم وەك جەنگاوەرێکی بریندار
ژانەکانی قوربانی زەردەخەنەیەك کرد
لەوێوو داوە دەزووی نیگاکانم لەو حەشامەتە سەردەبڕێن و
لەتەنهایی شەویش دەدرێنە سنگی خەوو

وەك كوللارەيەك بەهەوادا دەفڕين
ئاخر چاوەكان گۆشدراوى خوێن و
دەمەكان فرچك دراوى مەمك و
دەستەكان گيرۆدەى دەسرازەو
پێيەكان خليسكاوى نەدامەت
چى حەڵاڵەو چى حەرام
ترس
ترس پەيڤێكە لە كاروانەكانىشەهوەت دابڕاوەو
لە سوچى پەرستگاكان قامەتى مەييوە
هەورازەكانيش من و نشێوەكانيش تۆ
هەموو بەيان و ئێوارەيەك پاش من لە خەو هەڵدەستى و
پێشى من دەخەوى
راستيش ئەو وەهمانەن كە قەت لە كۆشى نزاكانمان نەبوونە هەڵم
تەتارى ئەمڕۆمانن لە گۆرستان
بە دواى شەويلاكى مردووەكان دەمانگێڕن
بينێك لە حەز تێرى نەكردين
نوچێك لە سێبەر ئۆقرەى نەداين
شەلاڵى كۆسپەكانى هەورازى عيشقين
رووح بە بەژنى بەردەوەش گۆرانى دەڵێ
جورئەت
دوێنێ مردوويەك جگەرەكێشانى تەرك داو
مناڵێكيش غەريبى بارانى دەكرد
كەشتى سەرم بەلايلايەى شەپۆلەكانت ناخەوێ
ئەى دەريا
پێخەڤ سوالكەرێك گەرمترە لە باوەشى نەرمى تۆ
سنگى والأى سروشت داخراوە
تا تەمەنى مانگەكانى دوێنێ گسك دەن



چونکە ئەشکەوت دیدەکانی دەڕژێنێتە دەریاو
ئەویش هێدی هێدی بۆ تریفەی ئەو مانگانە
دەیانخوێنێتەوە
بۆنی ئەو شەوانەی کە تەرنیمەکانیان وەکو ئاو سەردەبڕان
ئێستاش تارماییەکانیان بەدیار قەڵسی تەماشا نەخوێندەوارەکانمان
بەباڵێی ئاوەوە دەرەقسن
ئەی ئاو
مەگەر لەنجەی چوزەرە نەمامێك و
تیقەی پێکەنینی مناڵە هەژارێکی دوای نمایش کردنی چەندین جۆر
لە دەربڕینەکانی خۆشەویستیو
دواتر ورك و گریانی بە کوڵ
تا دینارێکی بە زەحمەت چنگ کەوتووی خراوەتە نێو لەپ
وەکو ئەو رووحەت پاك بن
کە بە داخەوە من نارژێمە نێوی
من ئەو قەتییەم بەهەشتی ژێر سەبەتێك
بەیانی گۆرانی ئازادیم فێر دەکا
ئەمڕۆش بەدیار داوە دوولەوە فەرشی هێلانەکەی بۆ جووتبوون
ڕێك دەخا
من حوزنی ئەو قەیرە کچەم کە لەودیو پەنجەرەکەیەوە
گەلا وەریوەکانی رۆشنایی تەمەنی دەژمێرێ
من سەری بێ مێزەری ئەو ترۆپکەم کە بزنە کێوییەك
دوا گوڵە رێواسی لێدەچنێ
چەخار بۆ ئەو رۆژانەی بەدیار گۆرانی ئاوەوە هەڵتووتا بووم و
هەنییەك نینۆکە بێنوێژەکانی دڵم نەشۆری
ئەگەر مەنزڵی ئەو بایە بدۆزنەوە
پێڵوەکانتان ئارامتر لە مەکی ئاسمان تامەزرۆیی دەشکێن
چاوەکانتان بشۆن

لەبەر شەستە بارانی فیغانی شمشاڵێك
وەرینی گوڵێك
کۆچی گیایەکی وەرزی
لێك ترازانی چڵ و بولبول پاش دادانەوەی پەردەی شانۆی بەها
یا ئەو ئاسکەی کە بێچوویەکی بێ گیانی تازە بووی
دەلێسێتەوە بێ هیوا
مەزهەبی خوێن ورێنەی کەڵە ئەهریمەنەکانە
دەستەکانتان لە گیرفان دەرکەن
بەڵکو سپی بووبێ
داردەستەکانتان ئازاد کات
ئاژەڵەکان خەتی جووت دەناسن
گوزەر بەسەر شۆستەکان بکەن چونکە
لافیتە یاساغەکان بە وردی لە دیوارەکان نووسراون
پێ مەخەنە کونی مار ئێوە ئێشکگری تاقانەیەك نین
دەبا پرسیاری گەش بۆ ئەم وەڵامە کرچانە بکەین
هەر تینی بیری تیژی هەتاوە
سەردانی ماڵی سێبەرمان پێدەکات
ئەگەرچی
سەفەر بێت و
تێشوومان
هەنگ بێت و
کەللەسەرمان
دژ بە ماچی لم بێت و
خەندەکانمان
ژاری ماربێت و
گریانەکانیشمان تیمساحی بێت

# لەباوەشی مەهوەشیەکدا

مەهوەشەکەم
گەر لە کەتیبەی
داخراوی دڵت دام
هەناسەم لە خرمژن و
دەنگم لە قرمژن
جوادا کەوە...
***
مەهوەشەکەم
گەر لەودیو
کەتیبەی دڵمەوە
گیرسایتەوە
(باوەڕ بەگۆرانیە دەرەکیەکانی
تەمەن مەکە
ئەوانە درۆ دەکەن)(١)
***
مەهوەشەکەم
گەر لەزمانی
هەڵکوڕمانم دەگەی،
بێ پەروا وەرە
سوورەتەکانی
عەشقی دوێنێم
بیر خەرەوە...
ئەو سوورەتانەی
لە ئاتەشگەکانی سەرابیشدا
چرایەکیان


**سەرکەوت پێنجوێنی**
سلێمانی

بۆ هەڵنەکرابوو...

ئەو سوورەتانەی

لە کڵێسەکانی ڕۆحمدا

زەنگێکیان

بۆ لێ نەدرابوو...

ئەو سوورەتانەی

(مەحوی) لە کەنارەکانی

عەدەم و

(ئەلۆگۆڤا)(٢) لە گیرفانە

دڕاوەکانی ئیرۆس

بۆی هەڵوەدابوون...

مەهوەشەکەم

گەر لەزمانی هەڵکورمانیشم

ناگەیت

ئەوا

بەم پەیڤانەت ئەسپێرم:

((دوولا لە فەنەری

چاوەکانی تۆ

پەڕەی سوورەتێك

لە سوورەتەکانی

عەشقی دوێنێ

دەبێتە کفنم و

لە نێوەندی سەیوانەکانی

(با)دا

سەردەنێمەوە))...!؟



(١) ئەم کۆپلەیە لە شیعرێکی ژنە شاعیری ئۆزبەگستانی (حەلیمە کاریاڤا) وەرگیراوە، ناوی شیعرەکە بەم شێوەیەیە: Each Three has a word to say...

(٢) ئەلۆگۆڤا: شاعیرێکی ناسراوی ڕوسیایە.

# برین



**سمکۆ محەمەد**

برینەکانیش
ڕەزمێکن لە وێنەی شکاوی موسافیر
نهێنییەکانیش
شەرحێکن لە ئەلف و بێ‌ی خەو
ئەوان تاسەی خنکاوی یاریکەرەکان لە ئامێز دەگرن
بە کراسێکی سپییەوە
وانەی عیرفانی باخەوانەکان لە قوڕ دەگرن
لە کەرنەڤاڵی قامیشەکاندا کەلێنێك لە بازنەی مەرگ دەکەن
دەڵێن لێرەیە حەقیقەت
برینەکان کە سامانێك بوون لە من
ڕەزمێك وێنە بوون لە بەرزی

بربنپیچەکان لە کانونێکی سارددا بە گەمەیەکی منداڵانە
تەماشایان دەکردو نەیاندەتوانی بە قادرمە شکاوەکاندا
سەر کەون
ئەوان گوناهی خۆشەویستی قژی گرتبوون
لەو دیوو پۆرترێتەکانی کاندنسکی‌یەوە
لەو دیوو پەنجەرە سورەکان و کورسیە سوورەکانەوە هاتبوون
بە کراسە ئاو دامانەکەیان سەمایان بۆ گوناه دەکرد
دەیانووت رۆیشتن رام کردنی راهیبەکانە بۆ قەشە
برینپێچەکان لە روانینانیدا دیار بوو دەیانووت
شەرەف هەڵقەیەکی تەلایی بوو ماسیگرێك وونی کرد
شەرەف مەمکی کیژێکی هەرزە بوو
شەوێك دزراو فڕێدرایە ناو چاڵێکی ئاتەشی پڕ لە
شووشەی کۆ نەکراوە
دەیانووت بەرزن نزمن
دەمێك دەبن بە سوراحی و مل کەچ دەکەن
دەڵێن یەزدان گەورەترە
دەمێك دەبن بە قوللەیەك‌و سەربەرز دەکەن
دەڵێن ببورن کەمێك لە پەرژینەکانتان بەرزترین
دەیانووت دەروازەی شەقامەکان هەڵنەگرین
نیوە شەوێکی بروسکەیی
کە ئەوادەی قسە بیۆنە دیقەتی گێلانە
دەیقەت لەو ئاسنە رەش و لوسانەی
مەملەکەتێکیان سوور کردبوو لە خوێن
هەر ئەو دەمە برینپێچەکان دەیانووت ئەسەرەتایە
دنەی مردووەکان بدەین قیت بنەوەو نە کۆتایی
مەراسیمەکانە لاوك بۆ گۆڕ غەریبان بڵێن
ئەو دەمە چی بوو خودایە
دەیانووت قاقلە جنۆکەش تانوتی لە کەلاوەکانی زەردەشت

دەداو لووتی دەگرت
دەرەختەکانیش دەیانویست خۆیان لە دەریادا ببینن
چاویان دەگرت
کچان بە دەما دەکەوتن و دەبوونە پۆلەمەل و
باڵیان دەگرت
ئەو دەمە من لە شوێنپێی برینەکانەوە دەهاتم و
گاگۆڵکێم دەکرد
لە حەقیقەتی گەنم رادەمام
دەستم بە پەتە شۆڕ بووەکانی دیوارەوە دەگرت و
رەنگەکانم نەدەناسی
پیرێکی لەرزۆکی چەماوە بە گوچانەکەی پێی ووتم
نە چیتە سەر لێواری حەقیقەت
ئەو چاڵە گەنمانە بۆ چاوی برسییەکان نین
گەر دەتەوێ بۆن بکەی جەمەدانییەکی تەڕ بدە
بەسەر لالە زارەکاندا
گەر دەتەوێ بیانبینی چاویلکەکەی مەولەوی لە چاوکە
گە ردەتەوێ درەختەکان بناسی
تەماشای ئەم وورده کاغەزە بکە لەگەڵ هەڵفرینی
کۆترەکان دەبێتە چ حەبیبەیەك و لە نالی دەگەڕێ
بچۆ لە گیرفانی عەباسیەکان بپرسە مەقەس بۆ نایانبڕێ
وەختێك قافڵەچیەکان بێ حاسڵی دەگەڕێنەوە
دەڵێن درەنگە بۆ ناسینی حەقیقەت
لە شوێن پێی برینەکاندا هەقیقەت کۆگایەکی هەمەرەنگ بوو
سێوێکی سوری فرێدراوی ناو بازنەکان بوو
گلێنەیەکی سپی شەرمنی چاوی جەللادەکان بوو
لە تەستیانێکی سەوزی ئابڕوبەری سۆزانیەکان بوو
فەقیانەیەکی زەردی گرگنە ترسنۆکەکان بوو
هەقیقەت هەموو شتێك بوو و هیچ



برین پێچەکانی دەیانووت
هەموو رەنگەکانی خۆش دەوێت
منیش بە برینەکانمەوە بۆی دەگەڕام
کە دڵی شەیتان لێی دزی بووم
هەر بەو برینانەوە ناسرابووم کە سامانێك بوون
لە جوگرافیای جەستەی من
برینی تەلاکانی دەستم
برینی مەرجانەکانی چاوم
برینی میتاڵەکان پشتم
برینی دارەکانی پەنجەم
برینی خۆڵەکانی جەستەم
برینی پەردەکانی سەرم
برین و   برین و   بری و
دەوڵەمەنترین جەستە لە برین
چەند قەتماغە بگرێن دەلاقە شکاوەکانی بیر ناچێتەوە
چەند سارێژ بێت چەقۆ کریستالیەکانی بیر ناچێتەوە
چەند سپی بێت شەوی گوناهە رەشەکانی بیر ناچێتەوە
من لە نێو سامانی برینەکان و
لە کتێبی پەڵەکاندا بۆ مەتەڵێك دەگەڕام
پەپوولە لە مەرگی بیستبوو
پەڵەی خوێنی رەش
پەڵەی هەوری رەش
پەڵەی گەنمی رەش
پەڵەی دەستی رەش
پەڵەی بارانی رەش
وەك شەهێنە فیتنە بازەکان چاویان زیت و
رەنگ ترسێنن
هەقیقەت شەهێنێکی گوناهکار بوو بێچووی

هەموومانی قووتدا
گەر گوناه نەبا
لە نێو گرکانی ئاگر پەرستەکاندا دەستی ئاوریشم چی دەکرد
لە نێو بڵێسەی مەنجەنیقەکاندا مەمکی فریشتە چی دەکرد
لە نێو تەنووری شەڕەکاندا دەنوکی کۆتر چی دەکرد
شەهێنەکان چ فیتنە بوون خوودایە
برینەکانیان دەژماردو یەك یەك هەڵیان دەدایەوە
برین پێچەکانیش کە هەندێ جار موعجیزە بوون و
هەندێ جاریش واهیمە هەندێ جار زەخرەفە بوون و
هەندێ جاریش تریفە
فێریان دەکردم لە نێو سامانی برینەکاندا
مۆخی دەڵەمە بوومان کۆ کەمەوە
جەستەی ترینجاومان لێکدەمەوە
لە باڵایەکی شەلاڵدا ئەلبۆمێك وێنە بگرم بۆ بەختیاری
وێنەی شکاوی شازادەکان
لە نێو برینی برینی تەلاکانی دەستم
وێنەی شێواوی جەللادەکان
لە نێو برینی دارەکانی پەنجەم
وێنەی دڕوای شەیتانەکان
لە نێو برینی بەردەکانی سەرم
وێنەی هەڵبزرکاوی خواکان
لە نێو برینی خۆڵەکانی جەستەم
برینەکان کە ئەلبۆمێك بوون لە هەقیقەت و
هۆڵێك بوون لە رەنگی گوناهبارو
بارێك بوون لە چەقۆ
تەنها برین پێچەکان دەیانزان چ سامانێکە...



# خواستێکی ناوەخت*



ماریا ئەحمەد

ئیمشەو لەسەر ڕایەخی تازێبارێتی
پرسەی خەونە سەربڕاوەکان
ڕۆحی بێدارم گیان دەدات
دایە! گەورەم سەروەرم
سایەم سێبەرم
دەستی کبریائی تۆو
عەنبەر سارای شیعرو
فرمێسکە مەییووەکانی ئەم بەفرە
شەونشینە نەبێ!
کێ هەیە خەمەکانم لەگەڵ دارەبەش کات؟!
بۆیە بەم شەوی یەڵدایە
شەوگەڕێك بووم، خدر ئاسادەگەڕام
سەبرم لە پشت کێوەکانی نهێنی، حەشاردا
هانام بۆ سوێیە چاو بەستکراوەکان برد
نەفرینم لەگەردە لوولە دڕکاوییەکانی جەفا کرد
بەسنگی ئەم کەونە پەژموردەوتە هییە
موبتەلایانە چوومە خوارێ
چنگم لە دڕکەزییەکانی
بەد کۆژەی ئاسمان گیر کرد
دەستم بۆ لقەکانی (توویا)[1] درێژ کرد
وەلی ئەفسووس

نەزەوی قووتی دام
نە ئاسمان ڕۆحی شێت و
شەکەتم لە خۆدەگرێ
نەمێژوو کوختەلانێکی پێ ڕەوا دیتم
سەرم شارە هەنگێکی نەحەساوەیە
جەستەم باڵندەیەکی باڵشکاو
قەدەر هەرە سی بە خەونەکانم هێنا
غایلەکان جێیان بەدالغەکان لەق کرد
فەتارەت لە کۆشکی بلووریی سروودەکانی دام
سوورەتەکانی سەر زاریان فڕاندم
ئۆغروخێر... سەفەرو خێر
ئەی خواستە نابەکام و ناوەختییەکان
بۆیە ئەسکەندەرانە گەڕامەوە
دایە، ئیمشەو بەس یەك کاتژمێر
لە ناو بێشکەی دڵە بێزارەکەت
لایلایە بۆ خەمەکانم بڵێ
بەسەر دو لکە غەریبەکانەت
کەم فامیلیەکانم ڕاهەژێنە
دایە ژیانی من و تۆ، ڕووبارە خەمێکی نابەهەقی
غافڵانە لێمان خواردەوە
بۆیە هەستی تۆو گەورەیی شیعرو
ئەم بەفرە خەمان باریووە نەبێ!
کێ بە خەیاڵاتی دڵی من دەزانێ؟!
شیعر ئەی کۆرپەی هەتیوی خاتوو خەونە
دەستوێی بەخەنە جوانە مەرگەکان.
تۆ نەبی کێ دەروازەی عەزابی ئەو عومرە
لەسەرمنی بە دڵ ماندوو دادەخات؟!
ئەی ئەهلی ئاسمانی بەزەیی
ئێوەش وەك کەسانی سەرزیندووی سەر زەوی
نازانم ئەوانیش نووستوونە یان بێدار؟
گیان دەدەن یان بێگیان؟



ئەی ئەهلی ئاسمانی شارە دڵ ئاشوفتە حاڵەکەم
ئیمشەو سەرم بەقەلەندەرخانەکانی عیشق داگرت
ئاهەق خانەیەکم دی لەزوڵم
ئاگام لێ بوو.....
ئەستێرەکانی سورەییا[٢] هاتن
سەرەخۆشیان لە ڕەنجی بەباچوو
لە ڕەنگی لەڕوو چووی من کرد
فریشتەکانی کەرووبی،[٣] عەرشی خۆیان بە جێ هێشت
بەدەستە نازکەکانیان
فرمێسکەکانی بێداریان سڕیمەوە
شەویش ڕەشپۆشانە
کڕنۆشی بۆ نازە لە خاچ دراوەکانم برد
مانگ تکاکارانە
لە دەرگای تازێبارێتییەکەی دام
باڵندە ڕۆح چکۆڵەکان
قەتارەیان بەست
یەك... یەك خۆیان بە پەنجەرەکەم داکرد
بە چپەی باڵە فڕەیان
پرشنگیان بە ڕۆح و چاو بەخشیم
دایە ئەی سەروەرم، کەسم، ئاوم
ئیمای ڕەنگ و ڕووەتم
دەزانی خەوی دڵبەرد، بوو بە گابەردی سەر ڕێگای
سەفەری شەوم
هەر نەجوڵایەوەو نەهات!
شەپۆڵەزامی ئەم خەمە سەروەرەم
نفرۆ کاااااات.

١. تووبا/ درەختێکە لە بەهەشت
٢. ئەستێرەکانی سورەییا/ کۆمەڵە ئەستێرەیەکن لە هاوینان دەردەکەون و پێڵووشیان پێ دەڵێن.
٣. فریشتەکانی کەرووبی/ گوایە کۆمەڵە فریشتەیەکن بەدەوری عەرشی خوادا دەسووڕێنەوەو خەریکی عیبادەتن

# ڕێژنە

چ هەورێکی ڕەش و پیسە
ئەم گەواڵە خەمە ئیتر مەکەرە بەر
ئەو تارکییە ئەتخواتەوە
ئەو نسێیە بدرە بەر
چەپکەتیشکی گڕی ئەوین
ئەو هەورانە بکە بە ماچ
ئەو تەمانەش بەدەسگیران
بێ دوو دڵی بمدەرە بەر ڕێژنەی باران
بمشۆرەوە وەکو تاوێر
وەك بەرد نوێژ و چەم و کارێ
ئەو گوڵانەش خۆر ماچ نەکەن
باخچە کە فرمێسك نەدزێ
نە سەوزایی و سێبەر دەکەن
نە باڵندەی کۆچەرانیش
لەناو پەنجەی دارەکانیا
چۆن هات هێلانە چێ دەکەن
ئەو هەورانە بکە بە ماچ
ئەو تەمانەش بە دەسگیران
بێ دوو دڵی بمدەرە بەر ڕێژنەی باران



یوسف لەتیف

نەخۆ لە گومان دەسوی‌و
نە تەراویلکەی ژان قوت دەدەی
نە بەدوو لەپ لە ئەستێلکی گۆمی چاوتا
پێکی ئەشك دەخۆیتەوە
نە من دەکەی بەو رووبارەی
سەرچاوەی خۆی بیرچێتەوە
لە کانییەك دەخۆینەوە
زنەی تا چاو هەتەر دەکا
چەندین بەربەستی بینیوە
چەند جاران خۆی
لە رووبار دزیوە
شیرینە وەك نوقڵ و نەبات
وەك ئەو هەنگەی
لەلێوی گوڵی مژیوە
رابە شۆخە شیرینەکەم
بەش ملوانکەی تاریکایی
بۆ گەردنی سبەینان بکە بە بانك
وێردی ئەو شەوانەت راژەنە
بۆ نازانی ساوای دڵم
بێ دەسرازەی دەستەکانت
شەرمن نابێ و
خەو نایگرێ
ئەو هەورانە بکە بە ماچ
ئەو تەمانەش بە دەسگیران
بێ دوو دڵی
بمدەرە بەر رێژنەی باران





# باوەشێنی تەنیایی

سەردار جاف

سەفەر دەڕواو تۆ نامبینی
گوڵی میحرابی یەخەم،
بۆ نازێنی...؟
گریانی خۆر
پەنجەی بەسەر شەرمی شەرم و وەغەر کرن دەنا
بزەی ماهی دراوسێمان
بالیفی خەونی ئەرخەوانی هەر خەون
بەخۆشەی جەستەما دەنا
ئا ئەم لەشە شەقار بووەم
حەسانەوەی، نێو کەندەلانی بێ سەروبن
عەنقای نێرە ئاتەشی بوو
منیش نغرۆی پیسی کرمن
شەو.. شەو.. شەوگار
بێزاری و نهێنی کار
هاوڕێی شەوو دۆستانی نیم
بۆ شار نشینی سەودایی نایەمەوە
کزۆڵەیی بێ دەڤەرم
بە ئاقاری شاری جوانان
ناخولێمەوە
گرمۆڵستانی پەنجەکان

بارانی خۆری لێ ناتکێ
سوێندم خواردووه
ئەو بارانە بەکەس نەدەم
تا سەرسەری (ندم) نەدەم
ئەو رۆژانەی
پیاوی مەزن
خوای جوانیمان دەسووتێنێ
ببوورن کەسە مێینەکە
دیسانەوە لێم ببوورن
نازانم نێرە یاخود مێ
سەری جەنجاڵمان لێ شێوا
(خوا سەریان لێ بشێوێنێ)
گێلە پیاوی ئەهریمەن بووم
بەخت رازو نیازێکە
بەخێرایی
بەردی قوبەی مرازداران
بەمەرقەدی شێخ دەنووسێ
ئەمجارەشیان لێم ببوورن
گێلێ نەبووم
ڤینۆس بۆ من دەغەڵێ بوو
لە جۆلانەی ئیزرانیلا
حەزەکانم پێکەوە بوو
نیشتمانی خۆشەویستیم
هەموو سپێدەیەک تاریک
ئێوارانیش ئاوەژوو
پێکەنین لەزەینی گوڵا هێشتا زووە
ئەم ئاوە نایەتەوە رێ
ماین کانیاوی خوێن ناگرێ
کاروان دەڕواو تۆش لە تولە رێی درێژا
لە غوربەتا... ئاوڕ نادەی
سەرت لەسەفەری گێژە





# کەڤاڵێك
# لە ڕەنگی وشکاییدا

بۆتان جەلال

پێخاوسی دار هەڵوژەکەم هەژاند
نەمزانی چیمەنستان بوولێڵێکە
ئۆخژنی بێ ناویی مەرگی دەفرۆشێ
ڕەنگاڵەکان لە مەراقی بازەوە بوون سەریان هەڵگرت
زەوی لە داخی بێ بارانی وشك و شەق شەق بووە
ئەهریمەن وەرزی هاتنە دەرەو گەشتیەتی
دوێنێ سەرێکی لە ماڵماندا
پێکرا سەردانی پیشانگایەکی نوشتە ئامێزمان کرد
ئەهریمەن شریتی کردنەوەی پیشانگەکەی پێ سپێردرا
من لە جیاتی ئەو لە دەفتەری پیشانگاکە
ئەم دێرانەم تۆمار کرد
((کەڤاڵە سکێچ سورەکانی بازەرەی با و قەوزەی دەروبەری دەوارە
سوتاوەکانی دێیەکەم ئەتلەسی ڕێناسێکی شارەزایان لێ شاردۆتەوە کە
دەمێکە شوێنەواران بەدوایدا وێڵن
لە نێو گێژەنی بوون و مەرگدا سەرێك بەقەد پیرۆزی دودیەکەی
نوح نوێم دەکاتەوە هەنگاوە تەناهیەکانی زوێر بوونی خواست و
پڕشەنگی تەلیسمی هەناسەمن ئەوەندە لە نێو تەمی هەناسە

سپییەکانی قەیرە کچەکان خنکاوم خەریکە باوەڕم بە دیدی
خۆشم کز ببێت من تا ئەمڕۆکەش بچووك دەبمەوە
لە نێوان دووکەڵی ئاگری دیٚ سوتاوەکەم و هەڵمی سپی هەناسەی
دەسگیرانەکەم وەك هێمای هاتووچۆ سەرم بەرەو دووریانێکی
بیٚ هاتنەوەیە کەمێك بەخشندەیی بەسەر دڵەڕاوکێم ببارێنن
نەبادا وانەیەك لە فڕین فێربم و وبەیەك باڵ بەرەو پاکیزەیی
خودا بفڕم دێیە سووتاوەکەم لە ئەنفال و هەناسە سپییە
دامرکاوەکەی دەسگیرانم دوو دیمەنی تەجریدی بوون بە دەستی
شێوەکارێکی بیٚ ویژدان کێشراون)).
لە هێزی گوڵ
توانای سەرکەوتن بەرەو خۆر وەرگرە
ئاشتییەکەی ئادام
کۆتایی بە گشت گوناهەکانی سەر زەوی نەهێنا
جارێکی دیکەش
تۆفان هەڵناسیٚ و نوحیش باوێشك نایباتەوە
لەم کێشوەرە خوادییەدا
پاپۆڕێك لە دارسنەوبەرێکی بەر بەفر چیٚ کەین
بەسەوڵی پاکیزەیی
دەریای گوناهە سپی و رەشەکانی پیٚ شەق بکەین
بازنە ئاگرینییەکان
بەردە شووشەییەکان
مشتیٚ دەنکە گەنمێکی ئەم ئۆقیانووسەیان پیٚ سەوز نەکرا
نەبادا زوو شەودابیٚ
با چرایەك لە فرمێسکی حەواو هەناسەی مەریەم هەڵکەین
ئەو رۆژئاوایە هەر بای لێدیٚ
درەختە پیرۆزەکانی‌د وێنیٚ و ئەمڕۆمان
بە دەمیەوە سەرسامن و پەنجەکانیان لە رووبدا کردوٚتە رەشماڵ
لە بۆنی درەختەکانی رۆژهەڵات زانیم
ئەمڕۆ رۆژ زوو ئاوا دەبیٚ
ژنە سك پڕەکان جمکی نەزۆکیان دەبیٚ
ئەسپی میر لە کاراون ناگەڕێتەوە

با رەنگبێ بۆ دواجار هێز لە خۆر وەرگرێو
هەورەکان بتاوسێنێ
لە تاریکی باخچەکان و دڵتەنگی شەقام
هێور بوونەوەیەکی ترسناك دەژمێرم
بەدەم چرپەیەکی سەوزباوی مەرجانیی
سۆناتای گۆرانییەکم داهێنا
رەنگبێ لە چلەی ماتەمینی هونەرمەندێکی شارەکەمدا بیچڕم
کە لە هەموو عومری خۆی پاداشت نەکرابێ
گۆڕی منداڵی یەکەمم زیاد لە پێویست درێژتر بوو لە چاوەکانی
دوو قاچەکەیم کردنە کێڵ
دڵم نەهات دوو بەردی بێ ناز قووت بکەمەوە.
موی سەر سینگ و دەستی چەپم
دەڵێی سپیاتییان کەوتوتێ
جاری خۆ ماوە بە دەم مەراق و سیا پەژارەیتان
بۆ هەموو تا سەو کۆستێکی ئێوە
چل رۆژان پرسە داگرم
تف لە قورگم وشك بێ
تیشکی خۆر هێندەی لە چایخانەی شاعیرە دەست بەتاڵەکانی دا
خەریکە رەنگی کاڵ ببێتەوە
وا بڕوا دوای چەند ساڵێکی دیکە
گۆچانێك لە مس و
شەبقەیەك لە گەسك و
چاویلکەیەکی نمرە ژێر سفر دەکڕێ
هەر کاتێ گەر بیەوێ بەیانیان
بەسەر دەفتەرە شڕوپڕەکانی شاعیرە دانیشتووەکانی
چایخانەی مەچکۆ هەڵبێ
شەقام وەرس بوو
وەرزەکان وەڕ بوون
شیعر پەکی کەوت
سمێڵەکانمان سپی بوون
تەنیا مەچکۆ نەبێ لە شاعیرەکانیهەولێر وەرس نابێ

# هەواڵ



**عەبدولقەهاری شێخ**

**بەسەرتاو رەنگ زەردیی گوڵەکاندا هاتی**
**بەسەر رووتانەوەی قژی درەختەکاندا هاتی**
**بەسەر گیانەڵای گیاکان و پرسەی سەوزاییدا هاتی**
**بەسەر تینویتی و برسێتی ئاژەڵ و ماڵات داهاتی**
**هاتی مرۆڤ شمشێری ئادادیی تیژ بوو**
**هاتی هەق چەشنی ئیسماعیل ملی لەموو باریکتر بوو**

هاتی خاك و خۆڵ و بەردو دەشتاییەکان
خوێنی زوڵمیان لێ دەچۆڕا
هاتی کانیو چەم و تاڤگەو بەنداوەکان ئاشی ئەجەلیان دەگەڕا
هاتی هێشتا باوکم دەستەکانی سوور بوون بە خوێنی ناهەقی خوشکم
هاتی تازە دایکم خوایەکی ئافرەتی لە ئوورەوە
بۆ براکەم هاوردبوو لە ئاشوبەکانی ئەشقی بپارێزێ
ئاوەدانیی ژووری ماڵی لێوان لێوبوو لە بێدەنگی
منالأنی ئاوی خەندەو خۆشنوودیان نەدەرژاندە کۆلأنەکان
ئاسمان کراسی تاریکی لەبەردابوو
وەزی سکی رووت و قووت بوو
لەبەرزاییەکانا هاتیو فەرمووت خۆناسینتان باش
هاتی بەدەم رێپێوی بەویقارەوە گوڵێکی سووری فیردەوسیت
دانایە سەر گۆڕی خوشکم
سوراحیێ ئاوی حەوزی پەشیمانیت بە دوو دەستی باوکم داکرد
دایکمت خستە بەرنانی، بەرتەنووری تەوبەکاریو خودایەکی میهرەبانی
ئاسمانیشت
کردە هاودۆستی براکەم چێژی ژیان و مردن و خەلأتی عەدنی هەتایی پێ
ببەخشێ
بەخێر
هاتی
ئەوا منیش گوێچکەم سووك و دڵم تەنك و رووحیانەتم ئامادە سازە
سوێندت دەدەم چیتر هەیە هەمووی بدوێ
کەتۆ لە ئاسمانا هاتووی
هەواڵی گەرم
قسەی سەیرت پێیە سرووش

# شووشە

**فەهد گردموانی**

سەربردەی خۆی
لە ناو شووشەیەکی بەتاڵ
زیندانی کردووە
تاوەکو نەڵێن هیچی نەبوو.
پایزەدار وێنەیەکی خۆی پێشکەش کرد
ژیانێکی گێژاوی نەخش کرد
کەلاوەیەکی قوڕی دەستنیشان کرد
جەستەی خۆی و مارێکی تێدا
زیندان کرد
شووشە لە خۆڕا هەستی بە سەروەری دەکرد
دەبێ ژیانی دوا هەناسەی مرۆڤ
شێوەی چۆن بە خۆوە بگرێ
دەبێ رووح لە لاشەی مرۆڤ
رەنگی چۆن بێ
کەمانەیەك هەستی دەکرد
پێویستی بە دوو پەنجەی ناسکە
شووشە لە خۆڕا دووپەنجەی بۆ قەرز کرد
کەمانە دەیویست گۆرانیەك بڵێ
ئاوازەکەی ئازاری پەنجە بێ
دیسان لەخۆڕا
شووشە گەروپەکی ناسکی پێشکەش کرد



# وەرزی پێنجەمی خەون



ئوسامە حوسێن

ماڵێك دەمانگرێینێ و ماڵێكیش بە پێكەنینمان دێنێت
من لە ماڵی یەكەم دەلاقەیەكم هەبوو وردە یادگارییەكانی پیریەتیە
هەمەیشەییكەم
تێدا دادەنا
ئەو دەلاقەیە تەنها لە زمانی بەهار دەگەیشت و تەنهاش سەفەری لەگەڵ دەریا
رەنگزەردەكەی پاییزدا دەكرد
ئەو دەلاقەیە تەنها ئیحساسی بە دەنگی پێی دڵ دەكردو تەنهاش تاریكی ئەو
رێگایانە دەیترساند كە ناچنەوە بەردەم ماڵەكەی خوا
ئەو دەلاقەیە تەنها هێماكانی فرمێسكە یاقووتیەكانی تەمەنی پەنجەرەی
دەخوێندەوە

ئەو دەلاقەیە نیشتمانێك بوو لە تێڕامان لە وشتانەی هەرگیز دووبارە نابنەوە/
بە بخووری ئەو ژنە هیندیانە مەست دەبوو کە هەموو داوایەکیان لە خوای ژ
نەفتی ئەوەبوو باران بەبێ مۆسیقای هەورەکان و مۆسیقاش بەبێ گۆرانیە
ئەمرەکەی ئاسمان بۆ دەرەوەی سێبەری دەلاقەکەم ئەنێری
ماڵێك دەمانگرێنێ و ماڵێکیش بە پێکەنینمان دێنێت
لە ماڵی یەکەم عیشق کەشتیەك بوو هەرگیز لەگەشتە دوڕاوەکان بێزار نەدەبوو
بە سروودێکی پەنجە نەرمەکانی پەنجەرە دەمامکدارەکان مەست دەبوو
ئەو عیشقە بۆ ئەوەی نەبادا تەسلیمی تەنیاییەکی هەمیشەیی ببم و گیانی بێ
هوەدیی تێکەڵاوی ڕۆژەکانم بێت هەموو جارێ ئەو گۆرانیەی بۆ دەوتمەوە
عیشقی دیتنی پەلکە زێڕینەیە لە پاش بارانێکی بەهار
عیشق خواردنەوەی چایەکە لەگەڵ بیرەوەرییەك لەکەنار پاش سەفەرێکی دوور
عیشق گۆرانییەکە تا گەورە بین زیاتر لە مانای وشەکانی بگەین سێبەری
تامەزرۆمان لێ دادەماڵێت
عیشق خوێندنەوەی کتێبێکە حیکمەتە شەیتانیەکانی زەمەنە
گەردەلوولییەکانی پیاسەی تێدا نووسراوەتەوە
ئەو عیشقە کە بەرووتی تەماشای جوانیەکانی دوێنێی دەکردم ژیان
بەگەنجیەتی دەمایەوەو تێم نەدەگەیش/ مردنیش بەرەو سەفەرێکی دەرەوەی
خەیاڵی دەبردم
من گوێم لێبوو ئەو دەریاوانە پیرەی کە لە کەناری دەریای زەمەن منداڵی خۆی
ڕاو دەکرد بە دەنگێکی بیستراو دەیووت
بەبێ عیشق بێدەنگی لەنێوچەوانی گفتوگۆکانمان دادەگیرسێت
بەبێ عیشق تەنیاییمان بیابانێکە لە غوربەت
بەبێ عیشق سازی خۆشنموودیمان لە ژەنین دەکەوێت
بەبێ عیشق هی
هێمنی ئاوێزانی ساتە ترسناکەکەنی بیرکردنەوەی پیاسەکانمان دەوروژێنێت
بەبێ عیشق ئازار لەزەت لەگەنجیەتی بوونی گیانە گەورەکان وەردەگرێت

ئەو کات بەناچارییەوە دەبێ بڵێین
عیشق بەجێت دەهێڵێن تۆش هەر لە گەڵمانی
عیشق بەجێت دەهێڵێن و تۆش هەر جانتا شڕەکەی سەفەرە بەردەوامەکانی پرسیاری
ماڵێك دەمانگرێنێ و ماڵێکیش بە پێکەنینمان دێنێت
کە کەس بە بێ خەیاڵ بەسەر پردی خەون ناپەڕێتەوە
کەس بەبێ خەیاڵ ماڵۆچکەیەك ناکات بەهاوڕێی دەریاوانێکی هەمیشە تەنیا
کەس بەبێ خەیاڵ ورخسارێکی شێواو لە ئاوێنەیەکی لێکترازاو بە جوانی نابینێت
کەس بەبێ خەیاڵ جەستەی ئافرەتێك بەرووتی لەبەربرانی راستیەکان راوناکات
کەچی ئێستا دەتوانم بەماڵێك بڵێم بەیانیت باش
ئێستا دەتوانم دەست بگەیەنمە روومەتی هەورێك و ماچی بکەم
ئێستا دەتوانم سەرم لەناوپرچی ئەستێرەیەك بنووێنم
ئێستا دەتوانم فرمێسکەکانی ئەو شەقامە بێ باوکانەش بسڕم
چیتر عاشقەکان بەتەنیایی بەسەرئازارەکانی ناپەڕنەوە
چیتر لە ژێردەریای ئەلەکتریکەکانی ژوان فرمێسك ماچ ناکاتەوە
ئەفسووس، چەند ساتێك بوون دواندنم لەگەڵ دەستە گەرمەکانی رێگا
بەبە خشە لە ئەتەکێتی رۆتین نەگەیشتم
تا لەئەلْ پیربوونی گەڵای چاوەکانی پەنجەرە حەسرەت بۆ گەنجیەتیە لەیاد چووەکەم بخۆمەوە
ئەوەك بە دیار ئەو فانۆسەی تەمەن هەڵکوڕمێم شیعرێك بوو کەسێك لە هیچ کەس زاڵتر کوژاندیەوە
بە دانپیانانەوە دەڵێم دڵم بە ماسیەکانی دەریای هیچ چاوێك ناکرێتەوە
لەمێژە دایکم دەیووت ئاوی دەریا سوێرە مەیخۆرەوە

هاوڕێکەیشم لەنامەیەکی دا بۆی نووسیبووم کەویستت ببی بەهاوڕێی ماسی خنکان لەبیرمەکە

نووسیبووی هاوڕێیەتی ماسی باڵندەیەکە هەرگیز روو لەو شوێنە نەکاتەوە تێدا پێکەنیبێ: باوکی دەستی رحمەتی بەسەر پرچە گراوزەکەی دانەهێنابێ/ ئەو دەیووت هەواڵەکانی سەر سپی بوونی گەنجیەتی لای منە وێستگەکانی قەدەر دەمناسێ

ئەو نووسیبووی گرنگە بزانی هاوڕێیەتی ماسی و سێبەر مەحاڵە/ منداڵیم ئەو حیکمەتەی لەنێو پیاسەکانی دۆزەخ فێر بوو/ دەریایەك لەوڕێنە هەستی پێکرد/ ئێستا بەتەنیایی نەبێ ئاسوودەیی دەست ناکەوێت/ مرۆڤ بۆ خۆشەویستی و ناوبانگی پێویستی بەتەنیاییە

لەوانەیە بڕوا بێنم کەوتنی گەلایەك لەناود ددانەکانی پاییزێکدا ئۆقرەیی دەبەخشێتە هاوین/ ئەو سوپاسگوزارە هەموومان بەشکۆمەندییەوە لە پێشوازی هاتنی دادەبین

خۆ هیچ نەبێت یادگارییەکانی ماڵی گەرمایی لای ئێمەبەجێ دێڵێت خۆ هیچ نەبێت هاوڕێکانمان لەبیر ناکەن و خۆشەویستی خۆیان لەناو پەیڤەکانیان بەدیاری بۆمان دەنێرن

خۆهیچ نەبێت مۆڵەتمان هەیە لە رازەکانی باو فرمێسکەکانی گریان و مۆسیقا خەمناکەکەی پەنجەرە بگەین

سوپاس ئەی ماڵی یەکەم کە بەتەنیا دەتبینم یادگارییەکانی مردنە رانەگەیاندراوەکەم خۆشترن/ سوپاس ئەی ماڵی یەکەم کە لەگڵ سۆناتای مردن بەخەونە نەورەسیەکانی هاوڕێیە هاوینییەکانم شاد دەکەی

دەهێڵێ لەسەر گۆڕی ماندووی رۆژە دوکەڵاوییەکانم جگەرەیەك بەیادی پێش لەدایك بوونی دوێنێ بکێشم

چاوێك بخشێنمەوە بەو قەسیدانەی کەسەفەرەکان لێی نەگەڕان تەواویان بکەم ئەو سەفەرانەی پڕ بوون لە خەون و جەنگەوە ............. تیایدا تەواو کرد



# تلیسان

سیروان ئاشاد

(بە مەراقە مترەکانی هاشم سەراج) پێشکەشە

لە چی دەڕوانی
ئیدی قارچکە خەونێك لە سایەی زرافە بالأی (بی) عەیارێکدا دەرنایێ
کوێوە دەچی گوندییەك پێی وتم
چەخماخەو تریشقەی عیشق سووتاو ئەم خاکە سوتماکە مەمکی دومەڵانی
حەزێك دەرناخات
بیر لەچی دەکەیتەوە
تازە عەردی گوناهەکان پەڵەیان داو کەستەکی ژێن تلیساوە
دوا ئایەتی سەمای وردە ژیخەکان بەتاڵ بوون
کانیەکی کوێرو کارێزێکی چاوکز پێیان وتم
ئاوەڕ بۆ کوێ
کچە عەیارەکەی پەچە ئەوێ دەمێ لەگەڵ ماڵینی قشپلەکانی بەخت
داماڵراو بێ سۆراخ کەت
بنوارە
ڕەشکەو هەگبەی خەونەکان لە کۆندەرەی تەمەن و لە زستانێکی توشدا
چیان لێهات
کاروانی کامەرانی بەدەسا قیبلەنومای درۆزن و سەمەرەکانی ئەستێرەی رێ
ونکەرەوە چۆن فەوت بوو
دەتەوێ گڵی مەرقەدی چ پیرێك ئۆخژنێ وەلەشی سڕدا بێنێ
لەم لمستان و وشکەلأنەدا مشتێك خۆڵە سوورەو پەیدا ناکرێ

غوسلێك دەركەین گوڵین گوڵ
ئیتر سەمفۆنیای گارە گاری مامرەڕەشە نابیستین هێلکەیەکی
بەختیاری لە رەزێکدا بدۆڕێنێ
بە (مووی سپی)ییەوە ڕێ لە چ چاو ڕەشێك دەگری
بێڵە قانەی تەمەن لە هیشکە عەردی باران نەدیو دانی وەری
لە کوێ کەنگری عیشق دەرهێنێ
– شامیلۆك – ی هەڵەتی جوانی (پیر بوو پیر)
سولەیمان لە دوا ساتەکانیدا پێی وتم
رەدوی بەلقیسی بەخت مەکەوە کرم مۆڵەتی بوونی تلیس کرد
لە دەنك دەنکی تەزبیحە پساوەکە رامام
زەمەنێکی مەیو رۆژانێ رچیو جەستەیێ (خێر نەدیو) ئاسۆو
سبەینێیەکی تەزیو تەزیو
لە کوێوە دەس پێبکەین
لە کۆڵانەکانی چاوشارکێو راکە راك و قۆچە قانی
لە شێوانێکی نزیك و (هەر کەس نایا بۆ وازی*
لە بۆنی (تەختەی مەدرەسە)و عەجولو بەرائەت و پاکی
یا کۆتا کەین (گەنم گرد جۆ بەلاو) (هەر کەس بۆ ماڵ باوکی)
لە نوکەوە بێهودەیە
کاتێ بارە گوێزیان داگرت گوند ئاهەنگی ساڵوەگەڕی خانەنشینانی دەگێڕا
کە کەشکۆڵی لەیستۆکە هیچنرایە شار وەرزی زاوزێ بەسەرچووبوو
منالْ قاتی
وەختێ لە کلکەی ئاوایی را هەگبەی مێوژ بەدەر کەت
دانەکان کلۆر داگەڕابوون
کە رەوە وەلاخێك لەبەرچنەی لیمۆ بارکران
ساڵ ساڵی باوێشك و پەتای نووستن داپۆشیبووین
کاتێ نامەی کوڕانی چیا بە کچە خرپنەکان گەیشت بەشوو چوو بوون
تازە سۆراخی مەرێکی لەڕان بەجێماو داد نادات مێگەل قڕ بوون
چ کۆڵێك وەرزی ئاوەدانی لەخۆ دەگرێ
مینبەرەکان دوا ئایەتی سوورەی ئەنفالیان تەواو کرد

هەواڵی دۆزینەوەی ژنەیەك لە توربەی كام تەتەر دایە
سۆمای كاریزان داهات و (مرواری چەو)و خشكەی ماراسای جۆگە
لە رەقساندن كەوتوون
ئێی
كاتێ هاتن ماڵێ لە نێو پەنجەكانمان چێ كەن هەڵوەری بوون
كاتێ شوێن پێكانمان كەتن مەحف ببوون
پاكیزەییش بە لەشی پیسەوە لە تابوتێكی رزیودا رێكرا
بە بستە عەردێكی گەنیومان سپارد
هاتن گۆڕێكی بە كۆمەڵ بووین
لە نووكەوە
بێهودەیە
ئالقەی تەقیوی نیگاو نواڵەكان لەیەك بدرێ كەوشەنێكین لە ترازان و
دابڕان
ئەمە یاداشتی شاعیرێكی رەشبین نیە
ئەمە حەقیقەتەكانی عومرە
دەتۆش ئەی شۆخ ئەی قەدەری پەنهانی سبەی
(ئەگەر هاتی نەرم وەرە نەبا فەخفوری نازكی تەنهاییم درز بەرێ)*
نەرم
نەرم
نەرم
لەچی دەروانی
ئاوەڕ بۆ كوێ
ئێی
لە نووكەوە
بێهودەیە

* دێرە شیعرێكی سپیهرییە

# دەرگاکانی خۆر



بەهرە موفتی

لەناو گەڕەلاوژەی وێل بووندا
شووشە
شكانی خۆی بۆ ناگێردرێتەوە
چ غەریبیێکە
چاو چاونا نامێتەوە
دەستەکان پڕن لە کاڵبوونەوە
دوێ عەشقی نامۆنە
گۆرانی بۆ ئاوابوون دەڵێن
ئاسمان پێ ناکەنێ
هەورەکان نارەوێنەوە
رۆح دادەچۆڕێ لە باران



چاو غەرق دەبێ لەشەپۆل
شەو شەوی خەوبینە
ئەستێرەکان باڵ دەگرن بۆ فڕین
چیمان لە ڕێبەندانە
با شێتی باهۆز
بە مەرقەدەکان بگێڕینەوە
توورەیی قەڵبەز
بە سەمفۆنیا کپ کەینەوە
هورەی تاوێرە بەردەکان
بە شنە با نەرم کەینەوە
چیمان لە ڕێبەندانە
با پەیژەکانی کێم و ڕشانەوە
جێ بێڵین
تونێڵی لمەلان پڕکەینەوە
پەرچونیە
سك پڕی ئەمجارەمان
هێور، هێور
کانیسکلەی پڕ ڕووبارمان
بتەقێنێتەوە
پێ دەچێ دەرگاکان بکرێنەوە
کلیلەکان بە هەڵپە هەڵپی
سەما بن
ئەی زەمین
ئاوبلکەدانی لەناو ڕێچکەی
دوێنێدا
زنجیرەی شەوی پساند

زەمهەریری زەمەنەکان
خۆیان دەرناخەن
چ شەوێکی یەڵدا بوو
چاوچاوی دەرژاند
دەست دەستی دەبڕی
تیشکەکان لێواولێو ببوون
کاڵبوونەوە
ئێستا کەنارمان ڕۆح بزوێنە
یەڵدای ئەبەنوس
پردی کازێوە
تروسکە دەبارێنێ
لەناو جەستەی هەورێندا
شیبای چاوەکان
تەڕ دەبێ
بحیلێنە هەر وەك هەور
بە گوێی نەبیستراو
بچریکێنەوە
رێمانە
لەناو پەتووی بەیەکچوونماندا
بچورێنەوە
لەسەر بەردە بازی
ڕۆحدا
دەستەکانمان درێژ ببنەوە
درێژتر
لە سنوری زریبا کات

# ڕووناکبوونەوە

ئاوات حەسەن ئەمین

ئەمەندە خۆمم لەبەر ئاوێنەیا هەڵخست.
لە چاوەڕوانیا.. ئاوی عاتیفەم بووە هەڵم.
ئەمەندە سێبەری سەرانم بینی..
تا حەقیقەت.. پشتی تێکردم!

*　*　*

دوای ئەوەی سەرجەم شەڕەکانمان کردو
وامان زانی سەرکەوتووین.
لە کەنارێکی جەنجاڵدا.. بۆ ساتێك ڕاماین
تۆ جەستەی برینداری ڕۆژانمت کردە بەیاخ و
لەسەر بەرزترین لوتکەی کبریائت داتنا
منیش ساتەکانی ڕاستگۆییمم
لەبەر پروسکی هیوایا ڕاگرت و
تا لەشەرما.. توا..یە..وە!
بەهەر دوکمان نەعشی نیشتمانە
ئەفسووناویەکەی عیشقمان
بەخشیە ڕەشەبایەکی تووڕە

ئەویش ـ زۆر بێ بەزەییانە بردی
دای بەدەم جۆگەلەی ڕۆژگارەکانەوە.
*　*　*

دوو ئەویندارى دۆڕاو بووین..!
سەرەتایترین یاسای یاریەکەمان نەپاراست
من وامزانی گەیشتومەتە دوا مەنزڵی خۆمو
لەسەر پشت لێی پاڵ کەوتم..!
بێ خەم، لەبەر خۆمەوە گۆرانیم ئەووت!!
تۆش خۆت دابووە دەست قەدەری هەرزەیت و
بێخەم، لەبەر خۆتەوە ئەتووت: دۆزیمەوە!
ئای کەمەزنی _ ئەوین_!
ئای کەناسکی _ ئەوین_!
لەپەشمەك ئەچی..
هەرزوو لەزاری درۆیا
ئە..تو.. ێیتەوە.. و
ئەبیتە شەکراوێکی تاڵ..!
*　*　*

لە ناوەڕاستی شەقامی ژیانا
_قەشەیەك_ ڕاوەستاوە، چاوەڕوانە
تا ئەوین دارە گێلەکان لەشەڕە دۆڕاوەکانیان
بێنەوە
لەگەڵ خۆیانا تەرمی دوا ژووان بهێنن.
ئەو_ قەشەیە چاوەڕوانە..
تا بزانێ یەکەم ماڵ کامەیە
دەروازەکەی والآ ئەکات..
بۆ ئەو تەرمەغەریبانە
ئەوساتە ئەویش بە خێرایی
ئەگاتە جێگای مەبەستو



قوداسەکەی بۆ ساز ئەکات!

*        *        *

دوو گەریدەی نەشارەزاو

دوو ڕێبواری سەر لێشێواو بووین

بەرانەتمان لەشێرو خەتێکی ساکارانەدا

دۆڕاند...!

لە چارەنووسی کەسمانا

ئەو کۆڵانە ئەچووە وەسەر بیرەوەریەکانی جاران

ئەو کۆڵانە.. لە گرێ کوێرەیەك ئەچوو

ئەو کۆڵانە.. دەرنە ئەچوو..!

ئەوینی ئێمەش .. سەربووردەی ئەو کۆڵانەبوو

بۆ ساتێك.. ئاسوودەیی نەبووە میوانی و

بەردەوام لەژێی تارێکی بچڕاو ئەچوو..!

بۆیە لە جیاتی ئاوازی خەندە.

ژاوەژاوی ڕۆژگارە دوکەڵاویەکانی ئەنوسیەوە.

*        *        *

ئەم ئەوینە.. لەگرێ کوێرەیەك ئەچوو..!

ئەم ئەوینە .. دەرنەئەچوو..!

ئەم ئەوینە.. نەئەچووەوە سەروەریەکانی مانگ..!

بۆیە ڕۆژگارەکانیش بێبەزیبانە

چەمۆڵەی ڕقیان تێگرتین.

(وامان زانی سەرکەوتوین..!

ئای کەگێل بووین.

١ ٤ ٢٠٠٠

---

* بەسەرهاتی قەشەکە: ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە. لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا ڕوویداوە. بەڵام لێرەدا بۆ مەبەستێکی‌تر لە شیعرەکەدا موتوربە کراوە

# دارستانێک لە شمشاڵ

بە یادی نافاتەکانی گوڵەوە، بۆ شەم



نامیق هەورامی

لە چەمەڕاخانەی ئەودیو کتێبەکانی (کامۆ)وە
چۆلەکەیەکی فاڵچی دەستمی خوێندەوە
- هێڵە چەماوەکانی نێولەپت
سەرەتای ئەو ڕێگایانەن دەچنەوە بۆ شەرگەکان
لەوێ ئاڵای سپی تەسلیم بوون
بەرماڵی سەربازەکانی ترسی مەرگە
جەنگ پەنجەرەی حەرامی ئەو ساختمانەیە
عەشق نەبێ..
هەموو شتێکی لێوە دەبینی
ئاسودەیی سەرخۆشەکانی شەقام نەبێت!
فەرسەخێکم مابوو بگەمە سەر جسرەکانی (جن)
کەنارییەکی قەیرە قاوەیەکی بۆ گرتمەوە
- ڕاستە هێڵەکانی ناو دەستت
کلاڤەی ئاڵۆزی چوار ڕیانەکانی چوون و نەچوونە
لەماندوو بوونی ئێوارانی ئەو گەڵایانەدا
دێنێتەوە
بوونەتە فرمێسکی درەخت

لەگەڵ گریانی (نالی)دا هەڵدەوەرن...
سڵاو...
سڵاو لەو کچانەی
جەنگ سەری سپی بوو
دڵۆپێك خوێنیان نەڕشت
بۆ عەشق نەبێت
بۆ شکانی قوفڵەکانی جەستە نەبێت. مەرحەبا... ساتەکانی ڕەها بوون
ئەودیو تەوتەمی شوشەکان
گوناهی ئەو خوایەی لێدەڕژێ
دەرگاکانی بە کڵۆم دراوی جێهێشت...
گوناهی داخرانی دەرگاکان بە ئەستۆی ئەو ڕیشۆڵانەی
بەدەم چاوەڕوانییەوە سەریان سپی بوو
بە ئۆباڵی ئێڵە ئێڵی ئەو ئاگرەی
لە تاریکی خۆیدا کوێربوو
لەبەستەڵەکی خۆیدا ڕچی...
بەر لە (عادە)بوونی کۆترەکان
ڕۆشتیەوە سەرێك لەو باخە بدە
سێوێك گۆرانی بۆ لاگاز بوون دەڵێت
لیمۆیەکی کەنەفت. لەسێبەری خۆیدا باوێشك دەدات
با لە مەکتەب دوا نەکەوێت!
کچێك لە خوار وەرینی گەڵاکانەوە
بە خوێنی بینوێژی هەنار
سەرپەنجەکانی ڕەنگ دەکات. پێی بڵێ
بۆ گەرمیان دەچین
با لە قافڵەکانی خەیاڵ دوا نەکەوێت
ئەمڕۆ دوا ڕۆژی پرسەی (ئەنفال)ە...
لەگەڵ سنەوبەرێکی مەستدا ئێوارەیەك لە (گوڵان)ەوە دێینەوە
قاچەکانمان ئاڵۆزکاون
وەك خەیاڵی هاوڕێکانم
سەرمان قورسە
هێندەی خەمەکانی نیشتیمان

وەك هەر چوار وەرزی هەڵەبجە
زەمەنێك وەك گۆناكانت.. كەمێ تاڵتر
گۆشتنتر لە قوڵەكانت.. خۆزگەیەك
لەودیو پەنجەرەكەتەوە زیندانێك.. هەندێك لەوەی خۆت گەورەتر
لەسەر خەتە.. رەنگێ لێدە
لێرە گۆرانییەكەت بێژە
دیوارەكان گوێت لێناگرن
عوزلەتی منو تۆ یەكە..
(ماركیز) دەزانێ عوزلەت چۆنە!
داركون كەرەیەكی هاورێم هەس
هێندە تاڵاوی دیلی چەشت
دارستانێكی سەراپا كردە شمشاڵ..
بێ بمكە بە شمشاڵێكی هەناو كون كون
كەمێك نەرمتر لە پەنجەت
بەچرپەیەك دێمە سەماو خۆم دەژەنم..
ئایەتەكانی عوزلەتی تۆ لە نوێژەكانما دەخوێنم..
تۆ نیشتمانت ون نەكرد
نیشتمان تۆی ون كرد!!
نیشتمانێكم هەبوو
چوار پەنجە لەخوار گۆی مەمكی چەپتەوە
لەنوێژێكی بەیانیدا..
ەلای مزگەوت سورەتێكی ترسناكی بۆ خوێندین
لەحەژمەتا لێم بزر بوو
لەوساتەوە..
قاوەی مەیوی گشت فنجانەكان گەڕام
دەسی مناڵەكانی گەرمیانم خوێندەوە
سارایەك تا چاو بڕ بكات چۆڵەوانی
تا تینو ئارەزوو كات قاقڕ
تا هەڵەبجە لێواو لێو سێو
نیشتمان بوو..!!..



١٦ ٤ ٢٠٠٠

# ئەوەی بەجێماوە...

# تەختە ڕەشەکانی

# تەمەنە

شێروان ئیبراهیم حەیدەری

کوخێکی تاریکەو چاومان لە پیاسەکانی خەونەوە دەرناچێ
مەمەڕێکی ڕووناکەو برژانگەکانمان لەنێو گۆرزەی خەو ناخەوتوون
فلوتی دەنگمان بۆ دارستانی بخوور دەسووتێ
کەچی سینەمان باغێکی کورتە بالآی ناوقەد بۆشە
بۆیە هەناسەمان
دوو دەنگە
ڕەنگمان دوو تخووبە
وێنەمان دوو وێنەیە
سێبەرمان دوو سێبەرە
هەندێ جار دوو دەبێتە سێ... چوار... پێنج
سێبەرو دووکەڵ و وێنەو ڕەنگ هەناسەمان لەیەکتر جودانابنەوە
با دەرگای باغی ئەو پەلکە زێڕینەیە بۆخۆی بنوێ

ئەوەی لەدەرەوەی حیکایەتەکانە هەمووی نووستوون...
زریان لە کۆتاهاتنی ماڵ یاری بەگۆنایان دەکا
شەماڵیش شۆخی لەگەڵ سەنتووری کەنارییەکان دەکات
کەنارییەکانیش ئەلف و بێی تەنیایی دەچڕن
ئەوەی بەجێماوە... تەختە رەشەکانی تەمەنە
لە دیواری راوەستانی یادگاریدا
ئەوەی لەمن بەجێماوە شاری گریانێکی توورەیە
پاکنووسی تەونی خاوبوونەوە دەکات...
ئەوەی لە تۆ بەجێماوە... چاو تروکانێکە لەنێولمی گوڵدانی مندا
با مێژو کوپەو گوڵدانەکان لە گۆرەپانی کۆتایی دابکەونە سەما
لە جیاتی من تۆ
لە جیاتی کۆتاهاتنی مێژوو
لەجیاتی ئاخرین پیاو
دیار هاتەوەو کەچی دیاری لە باخچە نییە
چاو لەو مناڵە مەنووقێنە...
بەخەندەیەکی میهرەبانی تێ دەگات لە دۆسیەی عیشقدا
با چەنگاڵەکان لە ئاقاری قاپی ئاگردا بسووتێن
ئەوە ددان کەوتووێك لە تەندووری بۆشایی قوڕدا دەسووتێت
ئەوە پشیلەیەکی ئاوکورخان سمێڵی لە هەڵزووران پاك دەکاتەوە
تۆ سەیری حەوشی ئەو دیو دەرگا مەکە
با دیمەنی ئەوە سەگە نەبینی کە خەوتووە لەسەر تەمەنی هێسکێکی کلۆر
لەناو ژووری خاوبوونەوەدا پیاسەم دەکردو
ئاخم پێش من دەکەوت
چیرۆکێکی پشوو درێژ سێبەری لەباوەشم دەکرد
پڕبوو لەنەفەسی هەڵاوسانی خونچەکانی تۆ
رستەکان بۆخۆیان بێزاربوون عەبەسیانە لە بازگەی دڵم دەڕۆیشتن

له میحرابی چاوێکی پڕ لەقسە دەبوونە سەوڵی بەلەمێکی شکاو
پێش ئەوەی تمیسالی لێوەکانم لەشانۆ مالایعنی بجووڵێ
کۆشم پڕدەبوو لە راکشانی تەرزەکان
گۆنام فریای ئەو لافاوە نەدەکەوت کە ماڵی ڕێبوارانی تێکدەدەا
بۆیە گوریسەکان بەفڕێ دراوی دەبوونە مەملەکەتی وشە
شانۆی زەردەخەنەیان شەق دەکرد
پێستی مانای پێکەنینیان رادەکێشا
ئەسپەکان بەرووتی دەگەڕانەوە
زینەکانیشیان لە گۆڕەپانی خۆڵەمێشدا دەبوونە دەربڕین
کێیە لە دەرگای بورجەکان دەدات
تۆزی بوەستە
منیش دێمە دەر لەگەڵ ئەو هەورە رەشماڵییە
شەستە باران نامەی میوانی منی پێیە
ئەی میوانی شەوانم
بالەژێر ئەو سواندانە بوەستێن
نا... با بڕۆین...
با چۆلەکەکان سەمای تەڕبوونی خۆیان تەواو بکەن
ئەو بورج ناسە کێیە؟ با نەڕوات...
من دەفتەری خەونەکانی یوسفم لێ دەوێ...
ئەو دڕناسە ماڵی لەکوێیە... باکوچ نەکات
ئەو بوردەی نەختەبووتەکانی لێ دەوێ
من کۆگای پەرت بوونی شەوقەکانم لێ دەوێ لەتاریك بوونی سەدەفەکاندا
تۆزێ بوەستە... ئەی نیشانە شکێن...
من دەوەستم لە ژوورە تاریکەکانی عیرفاندا لەبەرووەستانی ئەو کشە
کەچرکەکان ئالآیان تووڕدا... لەگەڵ مەلیك شانامەی بەخت دەنووسینەوە لە
دووریانی فەنابووندا.

# سێبەر

نەجات ئەسپیندارەیی

لە کەرنەڤاڵی دەنگەکان
لە نمایش بوونی رەنگەکان
سێبەری خۆمان لێ ون بوو
سۆراخی سێبەرێکی تر
بۆ من وەك مرواری ناو دەریای بێ بن بوو
لەو رۆژەوەی
سێبەری خۆمان لە دەست دا
کانی هزرمان وشك بوو
ئەستمان زاڵبوو بەسەر هەستدا
من نەمدیوە
هیچ تەنێك بەبێ سێبەر بێ
من نەمدیوە
هیچ سێبەرێك بێ رووبەر بێ

جەستە هەناسەی لێ برا
دەبێ بە خاك
درەخت کە سێبەری نەما
سفر دەبێ وەکو نمناك
لە باشوری دارستاندا درەختێك هەیە
سێبەرەکەی بەشی دوو باڵندە ناکا
بێ سێبەری وای کردووە
باڵندەکەم بە دوای تارمایشدا راکا
سێبەرەکە فەرشی باڵندانە
رەوە دێوێك لە نساری راکشاون
هێندە دزێو دێنە بەرچاو
دەڵێی تەرمن لەگەڵ خاچ شەتەك دراون
چەخماخە بێ گەردولوول بێ زەنگ لێبدا
قەت خۆیان لە گوورە نابەن
مەگەر بە تەوژمی نەفخ
قورساییان لەسەر هەناسەمان لابەن
سێبەر نەما رەوە باڵندە جوانەکەش
زریان پەرێشانی کردن
لە وەرزی چاو پشکووتندا
سۆمای چاوەکانی بردن
هەڵەتە بوون بۆ جەنگەڵان
کەس نەبوو گلییان داتەوە
کەنار دڵی گەورە نەبوو
دایك ئاسا ئامێزیان بۆ بکاتەوە.



# زەنگ

عومەر سوڵتان

مۆژدەی تەڕ بوون
باران بوو
بۆ بە ژین بوونی کەنارەکانی
دەریای هێنا
مۆژدەی ژین بوون
ئاوبوو
بۆ
فرۆشتنی تەڕایەتی
جۆگەلە سك تەڕوو
لێو ە وشکەکانی گۆی زەوی
باران نەبا
هەرگیز.. هەرگیز جۆگەلە
لێوە شەقار بردووەکانی خۆیان
مارە نەدەکردە گۆرانی ماچ
مۆژدە نەبا
باران زەوی ماچ نەدەکرد
لە ئاسمانا تینوێتی فریشتەکانی دەخواردەوە
پێکەنین نەبا
بەیانیان زوو ئاو گۆرانی
بۆ داربییەکانی قەراغ دەریا ماندووەکان نەدەگووت
نا
بە پەنهانی نهێنی تامی لە شیعری رەنگی ئاو دەدرڕاند
ماسییەکانی دڵنیا دەکرد
لە دەریاکان بێنە دەرێ
هاژەی هەنسکێکی دوای پێکەنین
بەخەگیری دار ژین دەبێ و
پەرچەمی کاتژمێرە قورمیش کراوەکان
بەسەمای سوڕانەوەی دەکارێنێ
زەنگ لێدەدا
لە مەرقەد لە خەو هەڵدەستێن

# مەزاری جورجەکان

پێشکەشە

بە (وێرانە خاک)ی

ت.س. ئیلیۆت



یوسف عوسمان

ئەو شەوانەی رۆشنایی مانگمان لێ دەچۆڕێ
ئێمە لە باوەشی ئەو باوشکانەین کەمناڵە بەخت سپییەکان دایاندەگرێ
لەوێش گوێمان لەفرمێسکی ئەو کوکوختیانە دەبێ
کە دەیانەوێ ختابی خۆیان بەسێبەری سنەوبەرە شەرمناوییەکانی شەو بناسێنن
سنەوبەرەکان.. ماچی میسکاوی دەکەن بەدیاری
باغەوانەکان... قاوە دەرژێنن لە جیاتی ئاو
کە چاوم ون دەبێ لەنێو دەریای فرمێسکدا
سەیری ئەو دوڕانە دەکەم کە بەشانەی قەوزەکان
وێنەی گۆم دەنەخشێنن
ئەو گۆمانەی بەبێ بۆق دەژین و لە دەریاچەیەکی غەمگین دەچن

سمۆرەکان لەنێو ئەو کەڤاڵەدا لەجیاتی بۆقەکان دەکەونە سەرپشت

لەشەو ڕادەمێنن

لەوە دەچێ شانۆگەری بۆقەکان تەواوبووبێت

کە (سوقبی سەوداو)(١) دەخوێنمەوە

چاوم پڕ دەبێ لەوەسیەت

شانەی دارینی سەرم پڕ دەبێ لە وردە گەڵای کۆشکی سپی

ئەوە حەقیقەتە یان یاری کردنە لە نمازگە ئاوییەکاندا

ئەوە بازاڕی وەهمە یان دایەلۆگی گەڕەکی جورجەکانە

ئەوە شهادەتی دووکەڵە لە دەفرە قیراوییەکانی ڕۆژهەڵاتدا

کە ئاسمان ی سەرم ژان دەکا

نێوچەوانم دەبێتە چیمەن و ڕەش هەڵدەگەڕێ

ئەوە گوناهی خۆر نییە کە لە کاولە خانووەکەی ئێمە جێنشێن دەبێ

دەڵێ: ......................

(سەبر بگرە ماڵی حەقیقیت ئێرەیەو ماڵی مەجازیشت

بەبێ سێ و دوو دۆزەخ)ە.....

ئەوساك، ئەز لە کوێ باڵندە دوو ڕۆحەکان

بدۆزمەوە...

ئەوان لەسەربانی تارماییەکانی وجودن

منیش لە کەناری کۆتاییەکانی وەهم یاری دەسازێنم

ئەوان لەودیو سێبەرەکانن

سێبەرەکانیش لەودیو پەرژینەکانی منن

وای ئەوە دۆزەخی ژیانە

یان ڕاوەستانە لەنێومەزاری جورجەکاندا.

---

(١) مەبەستم کونی ڕەش ە لە فەلەکدا.

# دڕك چنین

چیم دەسكەوت؟..
ولاتم پەناهەندەی خەرەندی
تەنگەبەری كەڕو لاڵێكە.
نادوێ
بمبە ئەو دنیەی
روح لە گۆڕستانی،
نانوێ
بەر لەوەی بمكەنە پەیكەری
خۆنەریستی گومان لێ كراوی
مێژووی ریاكاری،
دەچمەوە باریەك و
لەقاوغی خۆم دەژیم
بۆچی هاتووی؟..
هەور راپێچیی،
هەوا بدزی
زەوی بفرۆشی
كێ لە سەرەتای منی لە بیرە؟
كۆتاییشم دیارە!
دڕندەی سەردەم



حەسەن مەولود جاستانی

هاتووی سەرەتای فیرعەون و
نەمروود بێنیەوە ناو کۆتاییم
ئاکۆکی بچێنی
کێڵگەم ژەهراوی
کۆتری سپییم، رەش
رکم لە هەموو شتێکە
باخچە فێری ململانێ بوو
چیت هێنا بیبەوە
چیت برد مەیدەوە
برۆ
بخۆ
ناوم پیس
سیەم خورا
دوێنێم تاڵان کرا
وێنەی سێدارەم درا
کوا بیرەوەرییە غەریبییەکانم؟
چیا رما،
ئەستێرە نووست،
مانگ بەربۆوە
پەیکەرێك بۆ تاوان
پەیکەرێك بۆ دۆڕان
ئافرەت سواڵکەر
منداڵ برسی
کچ زەماوەندی شێت
ملوانکەی مردوو دزرا
ئەو گۆرانی بێژە بکرە
ئەو شیعرە هەڕاج کە
ئەو تابلۆیە بشێوێنە
کانیاو، وشك
چی ترت دەوێ



چیم پێ ما
خەون نەبێ
چیایەك ناناسی
هۆ پێ بە خوێن
خوێنی منداڵ
خوێنی ژنی سك پڕ
سەد ساڵی تر بنوو.
تاوان فڕێ دە ناو مێژوو
ئەو برینداڕەش بفرۆشە،
لە جیاتی بووکە شووشە،
نارنجۆك فڕێ دە كۆشی منداڵ
ئەو کچەی لە سێداره درا،
چاوی بکۆڵە
گۆچانی ئەو پیرەمێردە، مەدزن
گوڵی دەستی ئەو گەنجە، مەڕفێنن
بۆخچەی ئەو پیرە ژنەش گومرگ کەن
ڕازینن
بمرین
دڕك چێن،
بۆ كوێ ئۆغر دەکەی؟
ئێره وڵاتی ئەژدیهایە،
یان گۆڕی بەكری مەرگەوڕە؟
چ دڕکێکم تێ ئاڵاوە
تا سەدەیەكیش،
دڕك لە پێم دەرنایە
وڵات، وڵاتی دڕکەو
دڕکیش
دەمرێ و ... دەڕوێ و
کۆتایی نایە



ئەستێرەکان
لە چاوانما بێ ئەژمارن
بە کونی دەرزییەکدا دەڕۆم و بەکلاوڕۆژنەیەکدا
دێمە خوار
لە دیمەنی جوانی بەهاردا
خۆم بە قوورِ دەشۆم و بە ئاوی باران
مەلە دەکەم
لە کوخێکی نسرمی گوێ ڕووبارێکدا دەژیم
لە بن دارێك لە هەوارێکی شەرکەشا
بۆنی گوڵ دەکەم
لە جریوەی مەل و دەنگی قاسپەی کەوی
سەر بەردێك گوێ دەگرم
چاوم دەبڕمە نساران
لە بن دارێك لە هەوارێکی بێ دەنگدا
خەمەکانم دەلاوێنمەوە!!
دەستم لەسەر سینەی دایکمەو فرمێسکەکانی بۆ دەسڕم
لەولاشەوە...
لرفە.. لرفی ئاوی دەم کەل
جۆگەی بەستووە!!!
بەناو تاشە بەردی کون کونا ڕێ دەکات
لە پۆلە ڕەوەزی نێو شاخان نیشانم گرتووە
لەناو حەشارگەکەمدا خۆم مەلاس داوە
بۆ پێکانی
نم.. نم دەبارێ و تك.. تك بەچاومدا دێتە خوار
بەدەستی زبرو قلیشاوییەوە
پرچی دایکم و پرچی سروشت دادێنم

**عەلی مەعروف شەریف**
سلێمانی

# چەمێک لە وشەو شەوێک لە باخەڵی...

شەهێن تەها

ڕۆژەکانم بە یەکەوە گرێ دەدەم
ئەیکەم بە سنورێکی بازنەیی و
لەچەقیدا
کۆشکێك لە خەیاڵ

دەروازەیەك لە چاوەڕوانی
چەمێك لە وشە
من شەوەکانم ئازارن
شەوێك لە چاوەڕوانی پڕ خورافەی ئەستێرەو مانگ
شەوێك لە ... چرکەکانی تەواوی بێ دەنگی
شەوێك لە باخەڵی چەم و
شەوێك لە مێوانی حەزێکی داستان ئامێز
شەوێکی تر شانەم بۆ پەرچەمی رووحی ئەنفالەکان
لە چەمدا دەنگ و بێ دەنگی تێکەڵن
خوڕەی ئاوو کپیی من
زریکەی زیندەوەرو هێمنیی درەختی ترساو لە خاچ
قاقای پەرییان کزی رۆحم
لە هەموان تێکەڵترن
چەم لە روحی شەیدابوون

چەم لە وشەی هەڵفڕین
چەم لە من و من لە چەم
سەودایی قەسیدەیەك بۆ سەرگەرمی پەرەسێلکەو
وەرەز کۆچی ماسیەکانە
ئەو ماسیانەی عەییارترن لە من
تەماشا کردنی لوتکە چی ببەخشێ
کە پێی ناوێرم
من ماندووی سەرو تینوی چاوم
مەگەر نیگایەك لە بەژنی ئەو
ئەویش بڕیاری نەرمە هزرێك و هیچی تر
من سەراپام وشەی تەزیووە
نزیکەی کانیاوو چەمم
هەر ساتێ وشەم بەفری باران
کلۆ کلۆ بەژن و باڵای داگیر ئەکا
لەو ساتەدا
ئاسمان منم
هەور منم
بەفر منم
ئیدی گڕێك لە سۆزی قەسیدەکانی نزار
لە رۆخی کوانووی تەنەموول
چی دی نیە هەردوکمان گەرم بکاتەوە
شەوێك لە باخەڵی چەمەکەدا
دڵم کرد بە دوو بەشەوە
بەشێکیان بوو بە ئارامگەی
گیانی گەلاوەریوەکان
ئەوی تریان توایەوە گەروی زەوی
هەر تنۆکێك لە کانیاوێك
بوو بەمیوان



# پوختەی کۆڕو چالاکییەکانی لقەکەمان

## ٧/٥ تا ٢٠٠٠/٩/١٢

### ڕەوتی وەچەرخان بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی



لە سەعات ٦.٣٠ی ئێوارەی چوار شەممە ٢٠٠٠/٧/٥ لە باخچەی کۆشکی ئازە ئێوارە کۆڕێکی بۆ مامۆستا عەبدولحەمید بەرزنجی بەناونیشانی (ڕەوتی وەرچەرخان بەرەو کۆمەڵگەی مەدەنی) سازکرد.

مامۆستا عەبدولحەمید باسەکەی بۆ سەر دوو تەوەری سەرەکی دابەشکردبوو

١. لایەنی تیۆری ٢. لایەنی پراکتیکی

سەرەتا باسی لە بایەخی کۆمەڵگەی مەدەنی کرد جگە لە چەندان پێناسە دەربارەی ئەو کۆمەڵگەیە و ئاماژی بەوە کرد مێژووی مەدەنیەت دوورودرێژە، بۆ نموونە ماکس ڤیبەر بە شێوەیەکی زانستیانەی هەوڵیداوە چەمکی مەدەنی بخاتە روو هەروەها پەیوەندی دەوڵەت و ئاینی خستە روو.

لە درێژەی باسەکەیدا مامۆستا عەبدولحەمید سێ مەرجی سەرەکی بۆ کۆمەڵگەی مەدەنی خستە بەرچاو:

١. بوونی کۆمەڵ ٢. بنەمای ئابووری ٣. بنەمای سیاسی

دوای تەواو بوونی کۆڕەکە، لەلایەن بەرێزان (عەبدولخالیق سەرسام، ئاواز عەبدوللا، ئازاد حەمەدەمین، فەیسەڵ دێهاتی، قاسم موکری، سەیران سەلاح، ئازا حەسیب قەرەداغی، عومەر شێخەڵلا) گفتوگۆ دەربارەی بابەتەکە کرا.

کۆڕەکە لەلایەن د. عومەر پەتیەوە بەرێوە چوو.

# ئاسایش و بەرژەوەندی و ئامانجی نەتەوایەتی کورد



لە سەعات (٦,٣٠)ی ئێوارەی چوارشەممە ١٢/٧/٢٠٠٠ لە باخچەی کۆشکی تازە ئێوارە کۆڕێک بۆ مامۆستا نەژدەت ئاکرەیی بەناونیشانی (ئاسایش و بەرژەوەندی و ئامانجی نەتەوایەتی کورد ساز درا)

سەرەتا مامۆستا نەژدەت باسی چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی کردو وتی: دیاردەیەکی تازەیەو لە رووی زانستییەوە دیراسە کراوەو چەندان پێناسەی بۆ کراوە، بەڵام تا ئێستا لەسەر پێناسیەک رانەوەستاوە.

لە درێژەی باسەکەیدا مامۆستا نەژدەت باسی رەگەزەکانی ئاسایشی نەتەوەیی کرد کە سێ رەگەزە:

١- رەگەزی سەربازی.

٢- رەگەزی ئابووری.

٣- رەگەزی سیاسی.

هەروەها مامۆستا نەژدەت چوار بنەمای بۆ ئاسایشی نەتەوایەتی کورد دەست نیشان کرد:

- پاراستنی قەوارە.
- بنەمای دامەرزاندن.
- بنەمای شارستانی.
- بنەمای ئەتنۆگرافی

دوای تەواو بوونی کۆڕەکە، بەرێزان (عەبدوللا ئاگرین، شێرزاد نەجار، خاڵە حەمرین، مەغدید حاجی، عیرفان مستەفا) گفتوگۆیان دەربارەی بابەتەکە کرد.

کۆڕەکە لەلایەن مامۆستا مومتاز حەیدەری بەڕێوە چوو.

## هیوا قادر لە ئێوارە کۆڕێکدا



لە سەعات (٦،٣٠)ی ئێوارە چوارشەممە ٢٠٠٠/٧/١٧ ئێوارە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ شاعیری دوورە وڵات هیوا قادر لە باخچەی کۆشکی نازە ساز درا.

سەرەتا کاک رێبوار سیوەیلی کە پێشکەشکاری کۆڕەکە لوو باسێکی لە ناونیشانی شیعریەتی بوون. خوێندەوەو دواییش هیوا قادر ئەم شیعرانەی خوێندەوە:

- لە پێی دەستم بۆنی شەمامەی لێدێ.

ئێواران شوعلەی مۆمێک بەسە

ئێوارە ئەڕواو من لە جۆگەلەی رەنگدا ئەخنکێم.

چاوەکانمان.

دڵم پڕەلە خوێن گڕ

لە کۆتایی کۆڕەکەدا بەڕێزان (ع.ع. یوسف، عیرفان مستەفا، خاڵە حەمرین، عەبدولخالیق سەرسام، ئەنوەر مەسیفی) دەربارەی دەقی شیعرەکان سەرنج و تێبینیان خستە روو.

## ورد بوونەوەیەک لە شیعری ئەمڕۆو دوێنێمان



لە سەعات (٦،٣٠)ی ئێوارە چوارشەممە ٢٠٠٠/٧/٢٤ لە باخچەی کۆشکی نازە ئێوارە کۆڕێک بۆ مامۆستا ئەحمەد سەلام بە ناونیشانی

(ورد بوونەوەیەک لەشیعری ئەمڕۆو دوێنێمان) ساز کرد، لە سەرەتای باسەکەیدا مامۆستا ئەحمەد وتی:

- لای من نەک ئەدەب بەڵکو کەرەستەکانی تری ژیان وسیلەن بۆ خزمەتی خەڵک و شیعریش پەیامێکی هەیەو بە ئەمانەتەوە رایدەگەیەنێ.

دەربارەی ئەم پەیامە مامرستا ئەحمەد بیروڕای چەند رەخنەگرێکی عەرەبی خستە روو لەم بارەوەیەوە گوتی:

- شیعر دەبێ لە قسەی ئاسایی جیا بکرێتەوە.

لە درێژەی باسەکەیەدا، مامۆستا هێمای بەچەند دەنگێکی دیاری مەیدانی شیعریی کوردی کرد.

لە کۆتایی باسەکەدا بەڕێزان (جەلا دەباغ، ئیسماعیل بەرزنجی، عەبدو الخالیق سەرسام، سیروان ئاشاد، نیهاد جامی، سمکۆ محەمەد، فەرەیدوون سامان، ع.ع. یوسف، مامۆستا زەردەشت، حەسەن دانیشفەر، ئاسۆ حەسەن، عەبدوللا ئاگرین) بیروڕاو سەرنجیان خستە روو.

کۆرەکەش لەلایەن مامۆستا نەوزاد رەفعەت بەڕێوە چوو.

## پرۆفیسۆر د.ئەحمەد فەرهادی لە دوو ئێوارە کۆڕدا



بە بۆنەی گەڕانەوەی بۆ کوردستان، لقەکەمان دوو ئێوارە کۆڕی بۆ پرۆفیسۆر د.ئەحمەد فەرهادی لە باخچەی کۆشکی ئازەدا سازد کرد.

کۆڕی یەکەم لەمەڕ خوێندن و زانکۆو بوار جیاجیاکانی دیکەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو کە لە ڕۆژی ٣١/٧/٢٠٠٠دا ساز دراو تێدا لەو تەوەرانە دوا:

- مێژوو و جوگرافیای ئەمەریکا.
- راگەیاندن و جۆرەکانی لە ئەمەریکا.
- خوێندنی بالاّ لە ئەمەریکا.

لە کۆتایی باسەکەدا بەڕێزان (مەحموود زامدار، نوورەدین سەعید، د.ناسیح غەفور، کەریم شەریف قەرەچەتانی، عەبدولحەمید بەرزنجی، مومتاز حەیدەری) سەرنج و تێبینیان خستە روو، کۆڕەکەش لە سەعات (٦.٣٠) ئێوارەی رۆژی دوو شەممە، لەلایەن د. شێرزاد نەجار بەڕێوە چوو.

کۆڕی دووەمی پرۆفیسۆر فەرهادی کە رۆژی دووشەممە ٧/٨/٢٠٠٠ لە هەمان کات و شوێندابوو، بەناونیشانی (زانستی زمان) ساز کرا.
لەو کۆڕەدا پرۆفیسۆر فەرهادی تیشکی خستە سەر پێکهاتەی زمان و چۆنیەتی دارشتن و زمانی ستانداردو نموونەی بە زمانی ئینگلیزیو زمانانی دیکەی جیهان هێنایەوە.
لە کۆتاییدا بەڕێزان (د.عەبدوللا ئاگرین، عومەر فەرهادی، شێرکۆ بابان، ئازاد نەقشبەندی، عیرفان مستەفا) بیروراو سەرنجیان خستەروو.
کۆڕەکەش لە لایەن د.حەمە نوری عارف بەڕێوەچوو.



## کۆڕێک بۆ یادی مێژوونووس مامۆستا تایەر حەوێزی

سەعات (٦.٣٠)ی ئێوارەی دووشەممە ١٤/٨/٢٠٠٠ کۆڕێک بۆ یادی مێژوونووس مامۆستا تەیار حەوێزی سازدرا.



سەرەتا مامۆستا کەمال غەمبار پێشکەشکاری کۆڕەکە، لەو وتەیەکی کورتدا باسی بەرهەم و ژیانی مامۆستای کۆچکردوو کرد.
مامۆستا کەریم شارەزاش بە درێژی یادەوەرییەکانی گێڕایەوە
بەڕێزان د. مارف خەزنەدار، مەجید ئاسنگەر، د.عومەر پەتی، بەهزاد حەوێزی هەریەکەان یادەوەری خۆیان گێڕایەوە.
لە کۆتاییدا بەڕێز جەوهەر حەوێزی هۆنراوەیەکی خوێندەوە.

## کێشەی کورد لە ڕێککەوتننامەی سیڤەردا



سەعات (٦.٣٠)ی ئێوارەی دووشەممە ٢٠٠٠/٨/٢١ هەر لە باخچەی کۆشکی نازەدا، ئێوارە کۆڕێک بۆ بەڕێز د.ناسیح غەفوور بە ناونیشانی (کورد لە ڕێککەوتننامەی سیڤەردا) ساز کرد.

لە سەرەتا باسەکەدا د.ناسیح باسی میرنشینە کوردەکانی ژێر ململانێی هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارسی‌و عوسمانلی کردو هەروەها باسی پەیمان و ڕێککەوتننامەکانی بەر لە سیڤەری کرد.

لە درێژەی باسەکەیدا د.ناسیح بەشێوازێکی ڕەخنەگرانە هەرسێ بەندی ڕێککەوتننامەی سیڤەر (٦٢، ٦٣، ٦٤) کە پەیوەندییان بە کوردەوە هەبوو، خستە بەرباس.

لە کۆتایی کۆڕەکدا بەڕێزان (خاڵە حەمرین، د.شێرزاد نەجار، زیرەک کەمال، عەبدولکەریم فندی، حەیدەر لە شکری، کاکەڕەش نەقشبەندی، شێخ یەحیا برزنجی) سەرنج و بیروڕایان خستە ڕوو.

کۆڕەکە لەلایەن مامۆستا مومتاز حەیدەری بەڕێوە چوو.

## جەدەلی وردیلەیی و قەبەیی لە هۆنراوەی جوانی بێ ناوی گۆراندا

سەعات (٦.٣٠)ی ئێوارە دووشەممە ٢٠٠٠/٨/٢٨ لە باخچەی کۆشکی نازە، ئێوارە کۆڕێک بۆ د.لەتیف محەمەد حەسەن بەناونیشانی (جەدەلی وردیلەیی‌و قەبەیی لە هۆنراوەی جوانی بێ ناوی گۆراندا) ساز کرد.

سەرەتا د.لەتیف ئاماژەی بەوەکرد وێنەی شیعریی لای گۆران وێنەیەکی بەراوردەو لەدوو ڕوو پێکهاتووە.



لە درێژەی باسەکەیدا د. لەتیف هۆنراوە ناودارەکەی جوانی بێ ناوی خستە بەرباس و لێکۆڵینەوە
لە کۆتاییدا بەڕێزان (فیکرەت عیزەت، کەمال غەمبار، کەریم شارەزا، مومتاز حەیدەری، عیسا حوسێن، موحسین ئاوارە) سەرنج و تێبینیان خستە ڕوو.
کۆڕەکە لەلایەن د. ئیبراهیم قادر بەڕێوە چوو.

# ئەزموونی شانۆیی لابۆری لالش

سەعات (٦،٣٠)ی ئێوارە چوار شەممە ٣٠/٨/٢٠٠٠ لە باخچەی کۆشکی نازە ئێوارە کۆڕێک بۆ هونەرمەندی دوورە وڵات خاتوو نیگار حەسیب قەرەداغی بەناونیشانی (ئەزموونی شانۆیی لابۆری لالش) سازدرا.



سەرەتا خاتوو نیگار ئاماژەی بەوە کرد کە شانۆ تەنیا لە مەشق و نمایش پێک نەهاتووە، بەڵکو قۆناغی وەرشە لە هەموو قۆناغێک گرنگترە.
لە درێژەی باسەکەیدا خاتوو نیگار تیشکی خستەر سەر ئەزموونی لابۆری لالش کە ئێستا لە ڤیەننا خۆیو شەماڵ عومەری هاوسەری کاری تێدا دەکەن.
لە کۆتایی باسەکەدا بەڕێزان (سەیران سەلاح، کەمال غەمبار، نیهاد جامی، ژیلوان تاهیر، کاسترۆ مەجید، سەباح عەبدولڕەحمان، نیاز، عیرفان مستەفا) سەرنج و تێبینی خۆیان خستە ڕوو.
کۆڕەکە لەلایەن کاک ڕێبوار سیوەیلی بەڕێوە چوو.

## د. فەرهاد پیربال چیرۆک دەخوێنێتەوە



سەعات (٦)ی ئێوارە رۆژی دووشەممە ٤/٨/٢٠٠٠ لە باخچەی کۆشکی نازە ئێوارە کۆڕێک بۆ د. فەرهاد پیربال سازدرا کە تێیدا ئەم چیرۆکانەی خوێندەوە:

١. لامارتین
٢. چیرۆکێکی زۆر درێژی تراژیدی
٣. پەتاتە خۆرەکان
٤. شیزۆفرینیا

دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکان، بەڕێزان (عەباس عەبدوللا یووسف، ئەحمەد شەوکەت، عەلی مەحمود، ئەسکەندەر جەلال، نیهاد جامی، کەمال غەمبار) سەرنج و تێبینیان دەربارەی چیرۆکەکان خستە روو.

## لە یادی (١٠٠) ساڵەی جەواهیری نەمردا، کۆڕێک بۆ د.عەبدولحوسێن شەعبان

لە درێژەی چالاکییەکانی وەرزی سێیەمی لقەکەمان و وەک بەشدارییەک لە یادی (١٠٠) ساڵەی شاعیری گەورەی عەرەب و دۆستی نەتەوەی کورد (جەوهیری)داو بە بۆنەی سەردانی بەڕێز د. عەبدولحوسێن شەعبان بۆ کوردستان، کاتژمێر (٦)ی ئێوارەی رۆژی سێشەممە ١٢/٩/٢٠٠٠ لە باخچەی کۆشکی نازەدا کۆڕێکی بە ناویشانی (جەواهیری، وێنەی شیعر، وێنەی نیشتمان)ی بۆ ساز کرد.

سەرەتا د. شێرزاد نەجار لە کورتە وتەیەکی دا باسی ژیاننامەی د.عەبدولحوسێن شەعبانی کردو لە بارەی کتێبەکەی (الجواهری جدل الشعر والحیاه)چەند وتەیەکی نووسراوی رۆشنبیرانی خوێندەوە وئینجا بەڕێز عەباس عەبدوللا یووسف کۆڕەکەی گێڕاو وتی: ئێستا جەواهیری میراتی هەموو کەسێکەو خۆشبەختانە میللەتی کوردیش بەشی لەو میراتە هەیە. دوایی د.عەبدولحوسێن بە تێروتەسەلی لە جەواهیری دواو باسی (ژینگەو ململانێی جەواهیریو پەیوەندی بە دەولەتی عیراقەوە کردو بەشێکی وتارەکەی تەرخان کرد بۆ جەواهیری و کوردو بەتایبەت چامە بەناوبانگەکەی (**کردستان یا موطن الابطال**)و گەلێ سەرەباسی تر.

پاش تەواو بوونی بەڕێزیان هەریەکە لەو بەڕێزانە (د.عادل حسنی، زیوەر خەتاب، فەرهاد عەونی، زەید مەحمود، کەمال غەمبار، مامۆستا نەژادو د. خەلیل ئیسماعیل) راوبۆچوونی خۆی دەربڕی.

# نگێشه

ئەوەی لێرەدا دووپارەو سێ بارەی دەکەمەوە، هەمان خۆزگەی ناخی پەنگ خواردووی نووسەرو شاعیران و دڵسۆزانی زمان و ئەدەبەکەمانە، ئەویش زەرورییەتی بوژاندنەوەی یەکێتی نووسەرانی کوردە بە مەڵبەندی گشتی و لقەکانی سلێمانی و کەرکوکەوە، ئەوەندەی رەخسا بێ بۆ نووسەرانی چوار لقەکەو لێک هەڵنگفتن. بەتایبەتی لە رۆژانی سمیناری رێنووسی زمانی کوردی ساڵی ١٩٩٨ی لقەکەمان و فیستیڤالی ئەمساڵی رامان لە هەولێرو چەندین بۆنەی دی لە سلێمانی و تاران و کەرمەشان و سنە بوویێ بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە باس لەو یەکێتییە خاوەن مێژووە پڕ سەروەرییە کراوەو هیچ نووسەرو شاعیرێکیش نەبووە حەز لە بووژانەوەو پەرەپێدانی نەکات و بە پێویستیەکی مێژوویی نەزانێ...

هیچ پاساوو هەنجەتێکیش بۆ مراندنی مەڵبەندو دوو لقەکە نییە، چونکە ئەگەر مەڵبەندی گشتی پەیوەندی بە باری گشتی کوردستانەوە هەبێ خۆ دوو لقەکە لە سنوورێکی دیاریکراودایەو بوژاندنەوەی لقێکی نووسەرانیش نە پێشلکارییە نە دەبێتە هەڕەشەیەکی سیاسی لەسەر بەرژەوەندی کەس و لایەنێک، ئەگەر هەبن بڵێن ئەلتەرناتیفی تر لە گۆڕەپانەکە دروست کراون و هەمان ئەرک بەجێ دەگەیەنێ، هیچ دەزگاو رێکخراوێک ناتوانێ ئەرک و بەرنامەکانی ئەو یەکێتییە بەجێ بگەیەنێ. یەکێتی نووسەران دوای (٣٠) ساڵی تەمەنی ئێنجا لقی هەولێرو دەزگای چالاکترو پڕ بەرهەمترو بۆ رۆژگارێکی وەک ئەمڕۆ پڕ ماناترە لە ئەرکە نەتەوەیی و نیشتمانی و مەدەنیەکاندا.

ئاسانیش نییە رێکخراوێکی پیشەیی و ئەدەبی کارویەرنامەکانی خۆی بەسەربەستی و بێ لایەنانە پیادە بکات، لە رۆژێکی وەکو ئەمڕۆ. بەڵام هەر لایەنێکی دەسەڵاتداری ئەمڕۆ لەکوردستان ئەم بوارە بۆ ئەدیب و رۆشنبیرو رۆژنامەنووس و رێکخراوەکانیان لە سنووری بەرژەوەندییە نەتەوەیی و نیشتمانییەکان بەجێ نێڵێ گومان لە بڕوا بوونی بە ئازادی و فرە لایەنی و دیموکراسیەتەکەی پەیدا دەبێت. مەڵبەندی گشتی ئەگەر ببوژێتەوە دەتوانێ ببێتە پردێکی راستەقینەی هەردوولاو هەنگاوێکی عەمەلیش دەبێ بەو ئاراستەیەو خزمەتێکی گەورەی ئاشتیش دەکات. ئەگەر نووسەرانی کوردیش هەمیشە لە سەنگەری میللەت و دژی داگیرکاران و لەگەڵ ئاشتیدا بوونە، بەڵام گیانی بەرپرسیاریەتی لە قۆناغی ناسکی ئێستاشدا، نووسەران پتر هان دەدا بەو گیانە لە خۆبوردووەو ئاشتیخوازانەو دیموکراسیانەیە هەنگاو بنێن. هەر بۆ نموونە.... بە ژمارە ئەو راستیانە دەخەمە بەر چاوی خوێنەری بەرێز لقی هەولێر لە سێ وەرزی رۆشنبیریی خۆیدا وێڕای دەرکردنی (١٥) ژمارەی گۆڤاری نووسەری نوێ وەکو گۆڤارێکی ١٠٠٪ی ئەدەبی بێ لایەن و یارمەتی دانی مادی پتر لە (٢٠٠) نووسەر و (٥٠) کتێبی کۆمپیوتەر کردووە لەسەر ئەرکی خۆی بۆ نووسەرو شاعیران، پتر لە (٨٠) کۆڕو سمیناری زمانەوانی و ئەدەبی و فیکری ئەنجام داوەو بۆتە چەقی رۆشنبیریی و ماڵی هەموو نووسەران. ئەدی ئەگەر هەر چوار لقەکەو مەڵبەندی گشتیش لە چالاکیەکانیاندا بەردەوام بوویان و سەدان نووسەرو شاعیری لاوی خوێن گەرم و قەڵەم بەبڕشت وبەتوانا خۆیان سەلماندووە، کەچی بێ بەشن و ناتوانن ببنە ئەندام لە یەکێتییەکەیاندا، هەڵبەتە ئەوانەو دەیان پرۆژەی گەورەو پیرۆزتریش ئەنجام دەدران. ئەوەی کراوە بە دووشت وەدەست هاتووە:

- تواناو خواستی نووسەران خۆیان.
- پشتگیری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە رووی ماددی و مەعنەوییەوە.

بە هیوای نووسەران خۆیان بتوانن یەکێتیەکەیان ببوژێننەوەو ببنە پەیامبەرێکی راستی ئاشتی.

